ژمارە

١٩
( كانوونی یەکەم ) ی ٢٠٠٦



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

www.compmagz.com

## جەژنی قوربان و سەری ساڵتان پیرۆز بێت

بەرنـــــامەیەك بۆ وەرگێڕانی فیلمە بیانییەکان

چـــۆنێتی دروستکردنی مـاڵپەڕێك بـە خـۆڕایی

چـەنـد خـاڵێکی گرنگ بۆ پـاراستنی لاپتۆپ

پێناسەیەکی سیخوڕی کـردن لـە سـەر ئەنتەرنێت

ئەو بەرنامانەی کە پێویستە هەبن لە ناو کۆمپیوتەر




هەولێر ٢٠٠٦



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە
١٩
کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت

ناونیشان :
هەرێمی کوردستـــــــان/ عێراق ـ هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەلا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شـــوێنی نووسینگەی گۆڤاری کۆمپیوتەر بۆ هـەر پێشنیـــــار و سەرنجێـــك یان ناردنی بابەتێـــك .پەیوەندی بکـــەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە . :
دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری ـ بەڕێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر ـ یان ناونیشانی سەرەوە .
یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : 2527054 یان مۆبایلی سەرنووسەر 07504618045

یان پۆستي ئەلکترۆنی :

E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com
aras_co_center@yahoo.com

خاوەنی ئیمتیاز
وەزیری ڕۆشنبیری

سەرنووســـەر
ئاراز مەولود ڕەشید

بەڕێوەبەری نووسین
فاخر مەحمود میرزا

بەڕێوەبەری هونەری
سالم بابە شیخ

دەستەی نووسەران
ڕێناز ئەردەلان بەکر
کاوە سلیمـــان
شاخەوان عمر حسن

سەرپەرشتی چاپ
ئەهرۆ مەحمود



ئاگاداری :

بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ بـــڵاو کردنەوە لەگۆڤـــــــارەکەمان با بەتـــەواوی ئاماژە بکەن بەناونیشـــــــان و سەرچـــــاوەی ئەو بابەتـــەی کە دەینێرن وەهەروەها دەبێ ڕەچاوی ڕێسای نووسین بکەن لەگەڵ خالبەندی بۆ نووسینەکەیان بە پێچەوانـــەوە ئێمـــە بەرپرسیار نین لە





# پێرست





# ناوەرۆکی سیدی ژمارە ١٩

ئا : هیرش ئیسماعیل

| بەشی دژە ڤایرۆس | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| Bit Defender Internet Security 2007 | دژە ڤایرۆس |
| Dr .Web Anti Virus v4.33 | دژە ڤایرۆس |
| ESET ND 3272..51.30 | دژە ڤایرۆس |
| Kasper sky Anti-Virus 76.0.1.303 | دژە ڤایرۆس |
| Panda Internet Security Suite 2007 | دژە ڤایرۆس |
| **بەشی سیدی و کۆپی** | **کاری بەرنامەکە** |
| Alcohol 120% v1.95 | بەرنامەیەکی بەهێز و خێرایە بۆ کۆپی کردنی سیدی |
| Copy DVD Gold v2.15 | بەرنامەیەکی خێرایە بۆ کۆپی کردنی (DVD) |
| Nero Burning Rom v7.5 | بەرنامەی نیرۆی بەناوبانگ تایبەتە بە کۆپی کردنی هەموو جۆرەکانی سیدی |
| Power ISO v3.2 | بەرنامەیەکی بۆ کۆپی کردنی سیدی بە شێوەی ئیزۆ |
| Sly Soft Clone CD v5.2.9.1 | بەرنامەی کلۆن سیدی تایبەت بە کۆپی کردنی سیدی |
| Sly Soft Clone DVD v2.9.0.1 | بەرنامەی کلۆن سیدی تایبەت بە کۆپی کردنی ( DVD ) |
| **بەشی ئەنتەرنێت** | **کاری بەرنامەکە** |
| DSL Speed v3.6 | بەرنامەیەکی بە توانایە بۆ خێراکردنی پەیوەندی ئەنتەرنێت بە ڕێگای (DSL ) |
| Save Flash 3.0.67 | بەرنامەیەکە توانای پاراستنی فایلاتی جۆری فلاشی هەیە لە ئەنتەرنێتەوە |
| MSN_MESSENGER_DL_2 | بەرنامەی MSN بەناوبانگ بۆ گفت و گۆ کردن |
| Google Desktop Setup | بەرنامەیەکە شریتێکی ماڵپەری گۆگلت بۆ دەخاتە سەر ڕووبەری شاشەکە |
| pal talk 8.1 | بەرنامەی پالتۆلکی بەناوبانگی تایبەت بە چات و گفت و گۆ کردن |
| Nokia PC Suite 6.81.13.0 | بۆ بەستنەوەی مۆبایل بە کۆمپیوتەرەوە بۆ بەکارهێنانی ئەنتەرنێت |
| opera | نیشاندەری ئۆپێرای بەناوبانگ |
| Google Earth Setup | لە ڕێگای ئەم بەرنامەیەوە دەتوانی هەموو شوێنێکی جیهان ببینی |
| **بەشی دەنگ و ڕەنگ Multimedia** | **کاری بەرنامەکە** |
| ٣pg Converter Mobile | بەرنامەیەکە تایبەتە بە گۆڕینی فایلاتی ڤیدیۆیی بۆ جۆری ڤیدیۆی مۆبایل |
| Cyber Link Power DVD XP v4.0 - DTS Profes-sional | بەرنامەیەکە تایبەتە بە بەکارهێنانی سیدی جۆری DVD |
| Nokia Multi Media Converter | بەرنامەیەکە تایبەتە بە گۆڕینی جۆری فۆرماتی ڤیدیۆ |
| RM Converter 1.4 | بەرنامەیەکە تایبەتە بە گۆڕینی جۆری فۆرماتی دەنگیەکان |
| Windows Media Player 11 | بەرنامەی ویندۆز میدیا پلایەر دەرچووی نوێ |
| Xing | بەرنامەی زینگی بەناوبانگ کە لە توانات دەبێ وێنە لە پارچە ڤیدیۆیەك وەربگریت |
| Pmp Converter asf | بەرنامەیەکە تایبەتە بە گۆڕینی فۆرماتەکانی ڤیدیۆ بۆ فۆرماتی مۆبایل و MP4 |
| Prog DVB Power Install7.5.3 | بەرنامەیەکە تایبەتە بە نیشاندانی کەناڵە ئاسمانیەکانی سەتەلایت بە مەرجێکی کارتی سەتەلایت لەسەر ئامێرەکەت هەبێت |

# کۆبەندی بەرنامەکانی سیدی ژمارە ١٩

| بەشی فۆتۆ و دیزاین | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| ACDSee.v9.0.Photo.Manager.Incl.Keygen-SSG | تایبەتە بە نیشاندانی وێنە |
| Album Creator Pro v3.5 | بۆ درووست کردنی ئەلبومێك بۆ وێنەکانت |
| Animated GIF Producer v3.1 | بۆ درووست کردنی وێنەی جوڵاو |
| Cleaner Zoomer Professional v3.5.1c | بۆ دەست کاری کردنی وێنە |
| Fanta Morph Deluxe v3.6.5 | بۆ دەست کاری کردنی وێنە و گۆڕینی شێوەی دەم و چاو |
| Fast Stone Image Viewer v2.6 | نیشاندەرێکی خێرایە بۆ وێنەکانی ناو ئامێرەکەت |
| Flash Wallpaper Maker v1.10 | بۆ دانانی فایلی جۆری فلاش لەسەر باگراوەندی شاشەکەت |
| Icon Extract o v1.1 | بۆ درووست کردنی ئایکۆنە |
| Macromedia Flash MX | بەرنامەی فلاشی بەناوبانگ |
| Multimedia Builder 4.9.6 A | تایبەتە بە درووست کردنی سیدی ئۆتۆرەن |
| Photo To VCD 2.6 Pro | گواستنەوەی فایلی وێنە بۆ ڤیدیۆ سیدی |
| Selteco Flash Designer v6.0 | بۆ درووست کردنی فایلی جۆری فلاش |
| SWF Text v1.2 | بۆ درووست کردنی فایلی جۆری فلاش لە نووسینەکانت |
| SWISH max build 2005.11.16 | هاوشێوەی بەرنامەی فلاشە لە کارکردن |
| Web Page Maker v2.3 | بۆ درووست کردنی پەری وێب سایت |

| بەشی هەمەڕەنگ | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| 7-Zip v4.42 | بۆ کەم کردنەوەی قەبارەی فایلەکان |
| Adobe Flash Player v9.0.16 Final | بۆ نیشاندانی فایلی جۆری فلاش |
| AutoPlay Menu Creator Professional v6.7 | بۆ درووست کردنی لیست Menu |
| Chess Master 8000 | یاری شەترەنج دەرچووی نوێ |
| Golden Wafi | فەرهەنگ واڧ ئنگلیزی - عەرەبی |
| My Drivers v3.11 | بۆ پاراستن و گێڕانەوەی پێناسەی درایڤەکان |
| PDF Easy Converter v2.0 | بۆ گۆڕینی شێوەی فایلی pdf بۆ شێوازەکانی تری نووسین |
| PDF Password Remover v2.5 | بۆ لابردنی ووشەی نهێنی لەسەر فایلی جۆری pdf |
| Recover My Files v3.98 | بۆ گێڕانەوەی فایلە ون بووەکان |
| Serials 2k 8.1 (2004.3.1) | کۆمەڵێك ژمارە و ووشەی نهێنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر |
| Win RAR v3.60 | بۆ کەم کردنەوەی قەبارەی فایلەکان |

| بەشی سیستەم | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| 1st Disk Drive Protector v1.4 | بەرنامەیەکی بەهێزە بۆ داخستنی و شاردنەوەی بەشێك لە هارد دیسك |
| Advanced Office Password Recovery Pro v3.04 | بۆ گێڕانەوەی ووشەی نهینی فایلەکانی جۆری ئۆفیس |
| Boost XP v2.0 | بۆ خێراکردنی سیستەمی کارکردن |
| Clear All History v2.0 | بۆ خاوێن کردنەوەی کۆمپیوتەرەکەت لە پاشماوە زیادەکان |
| DAEMON Tools v4.03 | بەرنامەیەکی بەهێزە بۆ پاراستنی سیستەمەکە |
| Extract Now v4.28 | بۆ کردنەوەی فایلە پەستراوەکان |
| Folder Shield v1.4 | بۆ داخستنی فۆڵدەرەکان |
| Microsoft Private Folder v1.0 | بۆ نیشاندانی فۆڵدەرەکان |
| Shadow User Pro v2.5 | بۆ دانانی ناوی نهینی لەسەر ئامێرەکە |
| Sun Java Runtime Environment 5.0 Update 8 | بۆ بەگەڕ خستنی سیستەمی جافا |
| Turbo ZIP Cracker v1.1 | بۆ خێراکردنی فایلە پەستراوەکان |
| Un locker v1.8 | بۆ کردنەوەی فایلە داخراوەکان |

# بەرنامەی
# Photo Frame Show

ئا: فاخر عبدالله
fakhr_computer@yahoo.com

ئەم بەرنامەیە سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ دانانی چوارچێوەی ئامادەی زۆر جوان و نایاب بۆ وێنەكانت بە شێوەیەكی زۆر ئاسان و خێرا، پاشانیش دەتوانیت وێنەكان لە ڕێگەی ئیمێڵەوە بنێریت بۆ هاوڕێیانت یاخود سایتەكەتی پێ برازێنیتەوە و ئەم بەرنامەیە خاوەن تاقیگەكانی وێنەی فۆتۆگرافی سودێكی زۆری لێ وەردەگرن. سەرەتا دەتوانیت بەرنامەكە لەم سایتەوە دابەزێنیت: www.frameshow.com پاش دابەزاندانی بەرنامەكە بۆ ناو كۆمپیوتەرەكەت و دامەزراندنی لەسەر سیستەمی ویندۆز ئایكۆنی بەرنامەكە دێتە سەر ڕووبەری شاشەكە وُ بەو شێوەیەی لای خوارەوە دەیبینی لەسەر ڕووبەری شاشەكە.

دوای دامەزراندنی بەرنامەكە دەبڵ كلیك بكە لە سەر ئایكۆنەی بەرنامەكە لەسەر ڕووبەری شاشەكە ئنجا بەرنامەكە بەم شێوەیە دێتە بەردەستت بڕوانە ئەو وێنەیەی كە كەوتۆتە بەرامبەر ئەم نووسینە.

ئێستاش یەكە یەكە فەرمانەكان و چۆنیەتی كاركردنی بەرنامەكە ڕوون دەكەینە:

١- open image (Ctrl+O) بۆ هێنانی وێنەیەك كە خۆت هەڵیدەبژێریت لە ناو كۆمپیوتەرەكەتەوە.

٢- open frame (**Ctrl+f**) بۆ هێنانی چوارچێوەی ئامادە و هەڵبژاردنی پۆل و جۆری چوار چێوەی گونجاو لەگەڵ وێنەکەت:










دەتوانیت بە کلیک کردن لەم جێگایەی ئاماژەی پێ کراوە چوارچێوەی نوێ لە ئینتەرنێتەوە وەربگریت.

٣- **resize image** لە ڕێگەی ئەم فەرمانەوە دەتوانیت قەبارەی وێنەکەی گەورەو بچووک بکەیتەوە.

٤- **resize frame** لە ڕێگەی ئەم فەرمانەوە دەتوانیت قەبارەی چوارچێوەکە گەورەو بچووک بکەیتەوە.

٥- rotate photoبۆ سوڕانەوەی وێنەکە بەو شێوەیەی مەبەستە.

٦- rotate frame بۆ سوڕانەوەی چوارچێوەکە بەو شێوەیەی مەبەستە.

٧- save (**Ctrl+S**) بۆ پاراستنی وێنەکە.

٨- print (**Ctrl+P**) بۆ چاپکردنی وێنەکە بە هۆی ئامێرێکی چاپکەرەوە.

٩- email (**Ctrl+E**) دەتوانیت لە ڕێگەی ئەم فەرمانەوە وێنەکە بە ئیمایل بنێریت بۆ هاوڕێ و دۆستانت.

١٠- abawt چەند زانیاریەك دەربارەی کۆمپانیای بەرهەم هێنەری بەرنامەکە.

١١- leave to disktop (**Ctrl+L**) دانانی وێنەکە لەگەڵ چوار چێوەکەدا لەسەر شاشەکە.

١٢- get from disktop (**Ctrl+G**) هێنانەوەی وێنەکە لەسەر شاشە بۆ ناو بەرنامەکە.

## چەند نمونەیەك کەبە بەرنامەکە چاك کراوە










# بەرنامەی Visual task tips

## بۆ نیشاندانی بەرنامە کراوەکان لەسەر تاسك بار

ئا: بەختیار سەباح رواندزی
baxtear@zarikrmanji.com

ئەم بەرنامەیە بە قەبارە زۆر بچوکەو پێویست بە فێربوون‌و بەکارهێنان ناکات. بەڵکو هاوکاریی‌و یارمەتی دەرێکی باشە، بۆ ئەو کەسانەی کار لەسەرکۆمپیوتەرو ئینتەرنێت دەکەن. تەنها تۆ ئەوە دەکەیت دوای ئەوەی کە بەرنامەکەت دابەزاندە نێو کۆمپیوتەر پێویست بە بەکارهێنانـــی هیچ فرمانێـــك ناکـــات، کاتێك تۆ چەندیـــن بەرنامە بە یەکـــەوە دەکەیتەوەو دواتـــر(minimize ) یان دەکەی بۆ سەر تاسك بار، دواتر بۆ دڵنیابوون لەو بەرنامەیەی کە کاری لەسەر دەکەیت، ئاراستەی ماوسەکە دەبیتە سەر تاسك بارو لەسەر بەرنامەکە رادەگریت، بەرنامەکەت بە بچوکراوەی نیشان دەدات. بڕوانە وێنە ( ١ )



بە تایبەت ئەمە بۆ ئەو کەسانە باشە کە کار لەسەر ئینتەرنێت دەکەن‌و چەندین ماڵپەڕ بەیەکەوە دەکەنەوە. دواتر بۆ دڵنیابوون لە بوونەوەی ماڵپەرەکە ئەوە وەکو هەنگاوی پێشوو ئاراستەی ماوسەکە لەسەر هەر ماڵپەڕێك راگریت ئەوە نیشانت دەدات. وێنە (٢)



# Adobe Premier

زنجیره (١٣) لە بەرنامەی

ئا: فەیصەل مەعروف

## نووسینی دەق

بەرنامەی Adobe Premier ئامرازی گرنگ لە خۆ دەگرێ بۆ نووسینی دەق و شێوەو زیاد كردنی بۆ سەر دیمەنەكان ، ئەم ئامرازانە پیان دەگوترێ ناونیشان Titleبۆ كار پێكردنی:

- دەچینە سەر لیستی file و لە فەرمانی Newكلیك لە سەر ئایكۆنی Title دەكەین.(وێنەی١).
- راستەوخۆ پەنجەرەی تایبەت بە پێك هێنانی ناونیشان Titleبۆمان دەكرێتەوە. (وێنەی٢).
- پەنجەرەی ناونیشان كۆمەڵێك ئامرازی تایبەت بە ناونیشان لە خۆ دەگرێ ، كە بریتین لە ( وێنەی ٣):

١. تكێنەری وەرگرتنی رەنگ.
٢. ئامرازی دیاری كردن.
٣. ئامرازی نووسینی دەق
٤. ئامرازی وێنە كێشانی هێڵ
٥. وێنە كێشانی شێوەی سەربەست
٦. ئامرازی وێنە كێشانی چوار گۆشەی گۆشە تیژ
٧. وێنە كێشانی شێوەی بازنەیی
٨. ئامرازی وێنەكێشانی چوار گۆشە
٩. رەش نووس
١٠. نووسینی دەقی هەڵقولاو
١١. گۆرینی رەنگی و پڕ كردنەوەو باكگراوند
١٢. دیاری كردنی پانی هێڵ
١٣. نمونەی رەنگی باكگراوند
١٤. نمونەی رەنگی پڕكردنەوە
١٥. نمونەی رەنگی دووەمی كرداری پلە دار
١٦. نمونەی رەنگی یەكەمی كرداری پلەدار

- ئایكۆنی هەندێ لە ئامرازەكان لە دووبەش پێك دێت وەك ئامرازی وێنە كێشانی شێوەكان.




وێنە ١



وێنە ٢




وێنە ٣

- بەرنامەی Adobe Premierپاش دروستكردنی ناونیشان هەڵدەستیٚ بە زیاد كردنی لیستێكی نویٚ بە ناوی لیستی Title ، لە میانەی ئەم لیستە دەتوانین شێوە ودەقەكانی زیادیان دەكەینە سەر دیمەنەكان هەموار بكەین . (وێنەی٤).
- پێش ئەوەی دەق بنووسین هەڵدەستین بە زیاد كردنی باكگراوند لە پەنجەرەی ناونیشان لە پەنجەرەی Project (وێنەی٥).
- ئایكۆنیRolling Title كارا دەكەین كە تایبەتە بە دروستكردنی دەقی هەڵقولاٚو.(وێنەی ٦).
- دەچینە سەر پەنجەرەی نمایشی Title وكێرسەری ماوس دەجولێنین بۆ دیاری كردنی رووبەری بە دیار كەوتنی دەقە هەڵقولاٚوەكە . لە سووچی سەرەوەی لای چەپە كلیك دەكەین و ڕای دەكێشینە سووچی خوارەوەی لای ڕاستە .ئامانج لەم كارەشمان ئەوەیە كە دەقەكە لە خوارەوەی شاشە بە دەركەوێت و لە سەرەوەی شاشەش وون بێت ، بۆ ئەم مەبەستەش



وێنە ٤


وێنە ٥



وێنە ٦



وێنە ٧



- دەقەکە دەنوسین پاش نووسینی جۆر و قەبارەی خەتەکە دیاری دەکەین ، واباشە قەبارەی خەتەکە لە (١٦) کەمتر نەبێ. (وێنەی٨).



وێنە ٨

- کرداری ڕێز کردن بۆ دەقەکە ئەنجام دەدەین . (وێنەی٩).
- کرداری بینین ئەنجام دەدەین بە جولاندنی نیشانەی بینین Rolling Title Slider . (وێنەی١٠).



وێنە ٩



وێنە ١٠

# بەرنامەی MICROSOFT OFFICE WORD VIEWER 2003

## بۆ کردنەوەی پەڕگەی وۆرد بە خێرایی

ئا: بەختیار سەباح رواندزی
baxtear@zarikrmanji.com

ئەم بەرنامەیە قەبارەکەی زۆر گەورە نیە، کاری کردنەوەی فایلەکانی وۆردە بە شێوەیەکی خێرا ، بەلاّم ناتوانی دەستکاری لە فایلەکە بکەیت لە زیادو کەمکردنی هەر وشەیەك، تەنها دەتوانی چاپی بکەی. بەکارهێنانیشی زۆر ئاسانە هەر وەکو بەرنامەی وۆرد وایە، کاتێك کلیك لەسەر بەرنامەکە دەکەیت راستەوخۆ داوای کردنەوەی فایلەکەت لێدەکات. وێنە (١)



وێنە ( ١ )

بۆ ئەم مەبەستە فایلی مەبەست دەست نیشان دەکەین و کلیك لەسەر ( OPEN ) دەکەین، وە دەشتوانی هەر لەو بەرنامەیە بەهۆی فەرمانـــی ( Open For Editing ) فایلەکە بگوازینەوە بۆ بەرنامەی وۆردی ئاسایی و لەوێ دەستکاری بکەین. وێنە (٢ )




وێنە ( ٢ )

# AotuCad

## زنجیرەی ١١

ئا: غزالە یونس

لە زنجیرەی ئەم جارەدا باس لە تەواو کردنی زنجیرەی ڕابردوو دەکەین بۆ دروست کردنی پەنجەرە وبینینی ئەو ژوورەی لە کە لە زنجیرەی ڕابڕدوو درووستمان کرد ئنجا بۆ درووست کردنی پەنجەرە سەرەتا دووری پەنجەرەکە دیاری دەکەین بە دوو هێڵیی یارمەتیدەر وەك ( وێنەی ١) ئەو دوو هێڵەی بە ڕەنگی سپی دروستم کردووە . پاشان بانگی فەرمانی BOX دەکەین ماوسمان لە سوچێکی پەنجەرەکەمان دادەنێین ( وێنەی ٢) پاش ئەوەی ماوسمان لە سوچی خوارەوەی پەنجەرەکە دانا ئەوا لە خوارەوە لە سەرەتای شریتی چۆنی (الحالە) بۆوتانی x,y,z مان بۆ دەخوێنێتەوە لێرەدا ئەگەر سەرنج بدەین ئەو سوچە (٥,٢٦٦٦,٣,٤٩٢٤,٠,٠٠٠) ( وینەی ٣) تۆش لە شریتی زانیارییەکان ئەو ژمارانە بنووسە تەنها z ـی بەرزی پەنچەرەکە پیشان دەدات نووسراوە ٠,٠٠٠ تۆش بیکە بە ٠,٥ بەو شێوەییە (٠,٥٠٠,٣,٤٩٢٤,٥,٢٦٦٦) کە دەکاتە بەرزی پەنجەرەکە لەسەر زەوییەوە پاشان Enter پاشان ماوسمان دەبەینە سەرەوەی سووچی پەنجەرەکە (وێنەی ٤)












دووباره له سەرەتای شریتی چۆنی (الحالە) ماوسەكەمان بۆ دەخوێنێتەوە لەو خاڵە كە دەكاتە ٩,٠٦٤٤,٣,٦٩٤١,٠,٠٠٠ تۆش وەك خۆی بینووسەوە تەنها بەرزی پەنجەرەكە دەگۆ ڕێ بۆ نموونە ئەگەر بەرزی پەنجەرەكەمان ٢ م بێت ئەوە بەم شێوەیە بینوسەوە ٩,٠٦٤٤,٣,٦٩٤١,٢,٠٠٠ واتە سوچی سەرەوەی پەنجەرەكە ٢م لە سەر زەوی بلندە جا مەرج نیە هەر یەكێك لە ئێمە بیەوێت پەنجەرەیەك درووست بكات هەمان ژمارەی بۆ بخوێنێتەوە به پێی دووری و گەورەو بچووكی ژوورەكەی . پاشان




ISOMETRIC وەردەگرین (وێنەی ٥) ئەوا وێنەی پەنجەرە یەكمان بۆ دروست دەبێت (وێنەی ٦) . پاشان دێن بە مەبەستی جیاكردنەوەی پەنجەرەكە لەژوورەكە( وێنەی ٧) بانگ دەكەین كلیك لەسەر دیوارەكە دەكەین ENTER پاشان كلیك لەسەر پەنجەرەكە بە تەنها دەكەین ENTER پاشان بۆ وەرگرتنی سێبەر (وێنەی ٨) دوای ئەو وێنەی ژوورێكمان دەست دەكەوێت وەك (وێنەی ٩) .












بۆ دروووست كردنی بنمیچ وێنه‌كه‌مان ده‌گه‌ڕێنینه‌وه سه‌ر شێوه‌ی Top بانگی فه‌رمانی BOX ده‌كه‌ین له‌ سووچێكی خواره‌وه‌ی ژووره‌كه‌ ماوسه‌كه‌ داده‌نێین شریتی الحاله‌ ده‌خوێنینه‌وه ٢,٠٦٦٦,٣,٤٩٢٤,٠,٠٠(وێنه‌ی ١٠)




ئه‌وا وه‌ك خۆی ده‌نووسین ته‌نها بۆ Z كه‌ده‌كاته‌ به‌رزی خانووه‌كه‌ ئێمه‌ ٣م ده‌نووسین به‌م شێوه‌یه‌ ٢,٠٦٦٦,٣,٤٩٢٤,٣. (وێنه‌ی ١١)




پاشان له‌ سووچی به‌رامبه‌ری سه‌ره‌وه‌ ماوسمان داده‌نێین له‌ شریتی الحاله‌ چی نووسراوه‌ ده‌نووسین ته‌نها Z ده‌نووسین ٣,٢٠م واته‌ به‌رزی دیوارو بنمیچه‌كه‌٣,٢ ,١٢,٠٦٦٦,٩,٤٩٢٤. ئنجا سێبه‌رێكی بۆ وه‌ر ده‌گرین (وێنه‌ی ٨) پاشانیش ISOMETRIC ئه‌وا وێنه‌یه‌كی وه‌ك وێنه‌ی خواره‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌چێت (وێنه‌ی ١٢). ده‌توانین زیاتریش شتی تری بۆ دروست بكه‌ین بڕوانه‌ (وێنه‌ی ١٣)






# بەرنامەی ((محول الصوتيات)) گۆرانكاريە دەنگيەكان

ئا: ناظم ناصح

بێگومان هەموومان هەستمان بەو كارئاسانییانە كردووە كە كۆمپیوتەر لە ژیانی ڕۆژانەدا بۆمانی ئەكات لە گشت بوارەكاندا. جا لێرەدا ئێمە مەبەستمان بوارە دەنگییەكانە. هەموومان دەزانین كاتێك كە دەنگێك خەزن دەكەین وەك هەر شتێكی تر دەتوانین بە چەند شێوەیەك خەزنی بكەین وەكو (Mp3,Mp4, Wav,Ogg,Vox,Amr)جا ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە كە چۆن دەتوانین دەنگ لە یەكێك لەم شێوانە تەحویل بكەین بۆ شێوەیەكی تر؟ بێگومان بۆ ئەم كارە پێویستمان بە بەرنامەیەك دەبێت. ئەوەتا بەرنامەی(محول الصوتيات) بەرنامەیەكی عەرەبیە و زۆر بەهێزو زۆر ئاسانە كە لە توانای دا هەیە دەنگ تەحویل بكات بۆ ئەم شێوازانە (Mp3,Mp2,Wav,Ogg,Mp4,Amr,Ac3....) سەرەتا دەبێت بەرنامەكە لە ناو كۆمپیوتەر (Setup)بكەین وئنجا بیكەینەوە لەوێوە دەچینە سەر(محول الصييغ الأخرى) وەك لە وێنە(١) دا دیارە. ئینجا بۆ هێنانی ئەو دەنگەی كە دەمانەوێت تەحویلی بكەین لە لای ڕاست لە سەرەوە دەچینە سەر(إضافة ملفات صوتية) كلیكی لەسەر دەكەین ولیستی هاردەكانمان بۆ دەبێتەوە ئێمەش ئەو دەنگەی كە مەبەستمانە دەیكەینەوە وەك لە وێنە(٢) دا دیارە پاشان هەر لەلای ڕاست دەستەواژەی(تحويل الملفات إلى النوع) دەبینین كە لەژێرەوەیدا ئێمە دەتوانین ئەو شێوازە دەنگییە هەڵبژێرین كە دەمانەوێ دەنگەكەی بۆ تەحویل بكەین. پاشان ئەگەر سەیر بكەین لە ناوەڕاستی لای چەپ دوو بۆشایی دەبینین، لە بۆشایی یەكەمدا كلیك لەسەر لاكێشەكەی تەنیشتی دەكەین دەبینین لیستێكمان بۆ دەبێتەوە ئێمە یەكسەر كلیك لەسەر (OK)دەكەین بێ ئەوەی دەستكاری هیچ بكەین بەڵام ئەمە دەبێ هەر بكرێت. ئنجا لە بۆشایی دووەمدا كلیك دەكەین لەسەر لاكێشەكەی تەنیشتی لە وێوە ئەو شوێنە دیاری دەكەین كە دەمانەوێت دەنگەكەی تیا خەزن بكەین پاش تەحویل كردن.

دوای ئەنجامدانی هەموو ئەم كارانە لەلای ڕاست لە خوارەوە كلیك دەكەین لەسەر(**تحويل**) بۆ دەست پێكردنی گۆڕینەكە، كەمێك چاوەڕێ دەكەین تا بۆشاییەكەی ژێرەوە تەواو پی دەبێت كاتێك تەواو بوو دەتوانیت بەرنامەكە دابخەیت وبچیتە ئەو شوێنەی كە دەنگەكەت تیا خەزن كردووە دەبینیت كە دەنگێكت هەیە لەو شێوەیەی خۆت دەتەوێت.

<ins>تێبینی</ins>: دەتوانیت لەم بەرنامەیەدا دەنگ بە كۆمەڵ تەحویل بكەیت واتە لە كاتی هێنانی دەنگدا دەتوانیت كۆمەڵێك دەنگ دیاریی بكەیت و لەیەك كاتدا تەحویلیان بكەیت.....






# بەرنـــامەی فــلاش Mx

## زنجیرەی ( ١٣ )

ئا: گەردی

دیمەنەکان Scene

دیمەنەکان بوونەتە کارێکی رۆتین لە فلیمەکان و فلیمە کارتۆنیەکاندا ئەم تەکینکە بە کار دەهێنن، فلیمیش پێویستی بە رووداو هەیە و رووداویش بریتی یە لە دیمەنێك یا زیاتر، کەواتە دیمەن بریتی یە لە چەند رووداوێك. پێکهاتەکانی رووداو بریتین لە ( ژینگە ، کەسایەتیەکان ، کات ، بەستنەوەی رووداوەکان بە یەکتر ) وەکارەکەش لە سەرەتادا چیرۆکە. بەشێوەیکی سادە ئەمە روون بکەینەوە. دیمەنێك دروست دەکەین کە بریتی بێت لە بازنەیەك و ئەم بازنە بجولێ و خۆی بەدیوارێك دا بدات :



وێنە ١

٢. لە دیمەنی ئەم جارە دیوارەکە نمایش, دەکەین بۆ ماوەیەکی دیاری کراو. ( وێنەی ٢).



وێنە ٢

٣. لە ديمەنى سێيەم نزيك بوونەوەى بازنەكە لە ديوارەكە و پێكدادانى و پاشان گەڕانەوە و وەستانى نمايش دەكەين. (وێنەى٣).

٤. سەير دەكەين كردارى پێكدانەكە لە چوار چێوەى ژمارە (٣٠) ڕوودەدات لە پاش ئەم چوار چێوەيە بازنەكە دەگەڕێتەوە بە ئاراستەى پێچەوانە.



وێنە ٣

پێداويستەكانى ديمەن

١. دەنگ: بەشێوەيەكى كارلێكەر لەگەڵ ديمەنەكان زياد دەكرێ.

٢. جولەى گونجاو:هەوڵبدرى جولەكانى ديمەنكان كەم بن تاوەكو هەموار كردنى ديمەنەكان ئاسان بێت.

٣. ڕاپۆرتێ كە چەند ديمەن پێويستە بۆ كارەكە و هاوسەنگ بێت لەگەڵ ديمەنەكان جا گەورە بێت يا بچووك.

وێنەكان Art Work

وێنەكان لە فلاشدا بە پلەى سەرەكى سادەن و لە سادەيشدا هۆكارى يارمەتيدەرن بۆ بەرهەم هێنانى پارچەى وێنەى جوان.
وێنەش بە پلە يەك پشت بە خەياڵى وێنە كێش دەبەستێ، پاشان ڕەنگدانەوەى خەياڵەكەيە لە هێڵ و شێوەكان . نمونە (وێنەكێشانى ياريگايەكى تۆپى پێ). ( وێنەى٤).



وێنە ٤

# بەرنـــامەی Flax

کۆمپیوتەر

بەرنامەیەکی بەهێزە بۆ دروستکردنی تایتل و نوسین بەرنامەیەکی سادە و ئاسانە فێربوونیشی یەکجار ئاسانە شێوەی ئەم بەرنامە سادانە بە ڕاستی دیارە توانیویەتی کارەکانمان بۆ ئاسان بکات بۆ نمونە تۆ ئەگەر بێیتو بەرنامەی 3d Cool دابەزێنی و پاشان بچیتە سەری و چەند نوسینێکی لێ دروست بکەیت پاشان چەند جولەیەکی بدەیتە نوسینەکە بە ڕاستی ئەوە کاتێکی زۆری دەوێت هەموو کەسێك توانای ئەوەی نیە ئەو هەموو کاتەی بە فیرۆ بدات لە دیار بەرنامەیەك دابنیشێ بۆدروستکردنی شتێك بە بەرنامەیەك کە کاتمان زۆر لێ بگرێت بۆیە بەرنامەی Flax وەك ناوەکەی خۆی سادەیە بەڵام ئەو شتانەی کە دروستی دەکات بەڵکو دەگمەنە بەرنامەی زۆربەهێز نەیان توانیوە ئەم شتەی ئەنجام بدەن بۆ نمونە بەرنامەی Flax دابەزێنە پاشان بەرنامەکە بکەوە لە ناوەڕاستی بەرنامەکە بۆشاییەك هەیە نوسراوە Welcome to Flax تۆ لە جێگای ئەو نوسینە نوسینی خۆت دەنوسی بڕوانە وێنە ١

وێنە ١

پاشان سەیری بەرنامەی فلاکس بکە لە چوار پارچە پێکهاتوە پارچەی یەکەم کە لەلای دەستە ڕاستە لە ناوەڕاست Star هەیە بەگۆڕینی ئەوە جولەکانیش دەگۆڕێن هەروەها لەخوارەوە چەند ووشەی A دانراوە ئەوانیش بۆ ئەنجام دانی گۆڕانکاریە لەسەر نوسینەکە ئنجا دوای ئەوەی نووسینەکەی خۆت لە بۆشاییەکە دەنوسی و جولەیەکی پێ دەدەیت و گۆڕانکاری لەسەرژ درووست دەکەیت ئەو کات بە ئارەزووی خۆت لە شوێنێك فایلەکە بپارێزە بۆ ئەوەی دواتر سەیری بکەیت بڕوانە وێنە ٢

وێنە ٢

# Crazy talk

ئا: دەریا كۆیی
daryakoyiii@yahoo.com

ئەم بەرنامەیە بەرنامەیەكی گرنگی بواری وێنەیە كە توانای ئەوەی هەیە لە ڕێگەی ئەم بەرنامەیەوە دەم و چاوێكی وەستاو بخەیتە جوڵە ،وای لێبكەیت كەوا قسە بكات هەر وەكو ئەوەی كەوا خۆت ئەتەوێت بیخەیتە جوڵە،جا گەر حەز بە فێربوونی دەكەیت ئەوا لەگەل من دا ئەم هەنگاوانە جێبە جێ بكە تاوەكو سەر كەوتوو بیت لە بەكار هێنانی بەرنامەكە ،سەیری ئەم وێنەیە بكە وهەنگاوەكان بگرە بەر هەروەكو ئەوەی كەوا بەخاڵ ئاماژەم پێكردوە . . .




١/ بۆ هێنانی وێنەی مەبەست .

٢/بۆ هێنانی وێنە لە سكانەرەوە .

٣/بۆ گۆرینی ڕەنگی وێنەكە .

٤/گواستنەوەی خاڵی دەست نیشانكراو، جوڵـــــە كـــــردن خاڵەكانـــــی (دەم و چاو ) .

٥+٦/ بۆ برین و دانانی بەشی مەبەست بە ئارەزووی خۆت .

٧/لێدانەوەی كارەكان play .

٨+٩+١٠/ بەكار دێت بۆ گەورە كردن وبچووك كردن وهێنان و بردنی وێنەكە لە شاشەی بەر دەستت .

هـــەروەها لــــە ڕێگــــەی فەرمانـــی advanced facial setting كــــە دەكەوێتە پەراوێزی بەر نامەكە ،كە ئەمە وێنەكەیەتی





دەتوانیت گۆرانكاری بكەیت لە رەنگی (چاو وددان وشەویلگە لەگەل مەلاشوو)

بەشێكی تری فەرمانی ئەم بەرنامەیە بریتی یە لە فەرمانی script ،كە كۆمەلێك كاری گرنگی پێویستی تێدایە ،سەیری ئەم وێنەیە بكە تاوەكو بزانیت بەشەكانی ئەم فەرمانە هەر یەكەیان چ كارێك دەكات . . .

أ / هەلبژاردەكانی ئەم بەشە بۆ گەورەكردن وبچووك كردن وهێنان و بردن بەكاردێت .

ب /لەم بەشەدا كۆمەلێك دەنگی ئامادە كراوی بەر نامەكەمان هەیە بە زمانی ئینگلیزی وەك ئافرەت ،مندال ، . . . . .كە خۆت ئەتوانیت تاقیان بكەیتەوە .

ج /ئەم فەرمانانەی كەلەم بەشەدا هە ن تۆ دەتوانیت سوودیان لێوەر بگریت بۆ هێنانی مۆسیقا ، گۆرانی، نوسین ، وە خوێندنەوەی لە رێگەی بەرنامەكەوە ،لەگەلْ تۆماركردن (تەسجیل) كردنی راستەو خۆ .

**فەرمانی messenger** كۆمەلێك شێوەو ئامادەكراوی خۆی هەیە ،كە وێنەكەی دەكەوێتە ناوی وەك شێوەی سێوو سەعات .
**فەرمانی greting** كاری لە شێوەی فەرمانی پێشوە بەلأم ئەم جارە شێوەی(كارت) بە خۆیەوە دەبینێت ،كە خۆت بە تاقیكردنەوە زیاتر بۆت دەر دەكەوێت . لێرەدا هەر كارێك كەوا ئەیكەیت پێویستی بە پاشەكەوت كردن هەیە ئەم بەرنامەیەش هەروەكو بەرنامەكانی تر دەتوانیت كارەكانت بەم فایلانە خەزن بكەیت ،ئەوانیش web– media(avi)– mobile



دوای دیاری كردنی هەر یەكە لەجۆری فایلەكە ئەوا لە كۆتایی كلیك لەسەر فەرمانی Export دەكەیت و بەشە هاردێك دیاری دەكەیت بۆ ئەوەی جۆری فایلەكەی لە ناودا بپارێزیت تا دواتر بتوانیت بەكاری بێنیتەوە .

# بەرنامەی K-Lite Codec Pack بۆ وەرگێڕانی فلیمە بیانیەكان

ئامادەكردنی : بەرزان عباس البدری
barzan86@yahoo.com

بۆ وەرگێڕانی فلیمێكی بیانی بۆ زمانی عەرەبی دەتوانن بە هۆی ئەم بەرنامەیەوە ئەو كارە ئەنجام بدەن ئەویش بەم شێوەیەی لای خوارەوە ڕێگای یەكەم ڕۆیشتن بۆ سایتی http://subscene.com بەرێزان ئەم سایتە پێویست ناكات لە پێشیەوە (WWW) لێبدەیت . پاشان وەك لە وێنەكەدا دیارە ناوی ئەو فلیمە ئەنوسی لە ناو بۆشایی searchدا پاشان Enterبكە ... كە فلیمەكەی بۆ دۆزیتەوە ، ئەو زمانە هەڵبژێرەكە مەبەستتە . وەك لە وێنەی ژمارە (١) دا هاتووە .




وێنە ١

دوای ئەوەی فایلی وەرگێرانەكە ودەست كەوت: ئەم بەرنامەیە K-Lite Codec Pack وامەزەندە كراوە كە زۆربەی فایلە ڤیدیۆیەكان ئیش پێ دەكات ، تەنانەت (وێنە و فایلاتی فلاش ) ئیش پێدەكات . بە ڕاستی شتێكی سەیرە.. هەروەها بەرنامەیەكە قەبارەیەكی بچووك و خێرایە ئەمەش چەند جۆرە پرۆگرامێكە كە دەتوانرێ بەم بەرنامە بەهێزە ئیشی پێ بكرێت:

-Media Player Classic [version 6.4.8.7]
- ffdshow [build 2005-12-22]
- extra plugins
- ffdshow VFW interface
- XviD [version 1.1.0]
- DivX Pro [version 5.2.1]
- 3ivX Pro [version D4 4.5.1]
- CoreAVC [version 0.0.0.4]
- On2 VP6 [version 6.4.2.0]
- On2 VP7 [version 7.0.9.0]
- Cyberlink DVD decoder [version 6.0.0.1417]
- MPEG-2 (Ligos) [version 4.0.0.77]
- MPEG-2 (Cyberlink) [version 6.0.0.1402]
- MPEG-2 (MainConcept) [version 1.0.0.56]
- XviD [version 1.1.0]
- DivX Pro [version 5.2.1]
- 3ivX Pro [version D4 4.5.1]
- Windows Media 9 VCM [version 9.0.1.369]
- On2 VP3 [version 3.2.6.1 DT]
- On2 VP6 [version 6.4.2.0] [Encoding]
- On2 VP7 [version 7.0.9.0] [Encoding]
- Intel Indeo [version 5.2562.15.54]
- Intel Indeo [version 4.51.16.2]
- Intel Indeo [version 3.24.15.03]
- Intel I.263 [version 2.55.1.16]

- huffyuv [version 2.1.1 CCE Patch 0.2.5]
- MS MPEG-4 [version 4.1.0.3927]
- DivX MPEG-4 Low and Fast motion [version 4.1.0.3927]
- MP3 (Fraunhofer) [version 1.9.0.311]
- AC3 (AC3Filter) [version 0.70b mod]
- AC3 (AC3Filter) [version 1.01a rc5]
- Vorbis (CoreVorbis) [version 1.1.0.79]
- AAC (3ivX Pro) [version D4 4.5.1]
- AAC (CoreAAC) [version 1.2.0.573]
- MusePack [version 1.0.0.3]
- Monkey's Audio [version 1.00]
- WavPack (CoreWavPack) [version 1.0.3]
- FLAC (CoreFLAC) [version 0.4]
- Voxware MetaSound [version 1.0.0.12]
- AAC encoder (3ivX Pro) [version D4 4.5.1]
- MP3 (Fraunhofer) [version 3.3.2]
- MP3 (LAME) [version 3.97b1]
- AC3 (ffcHandler) [version 1.2]
- DivX Audio [version 4.2.0.0]
- MP4 splitter (Haali Media Splitter) [build 2006-01-15]
- Matroska splitter (Haali Media Splitter) [build 2006-01-15]
- Ogg splitter (Haali Media Splitter) [build 2006-01-15]
- Ogg splitter (OggDS) [version 0.9.9.5] and Ogg Vorbis DLLs [aoTuVb 4.51]
- MPEG-2 demuxer (Elecard) [version 3.1.190.41018]

- MPEG-2 demuxer (MainConcept) [version 1.0.0.54]
- MPEG-2 demuxer (Ligos) [version 4.0.0.77]
- SHOUTcast Source [version 1.0.0.1]
- DirectVobSub (a.k.a. VSFilter) [version 2.37]
- DirectVobSub (a.k.a. VSFilter) [version 2.33]
- Matrix Mixer [version 0.30b]
- Morgan Multimedia Stream Switcher [version 0.9.9]
- GSpot Codec Information Appliance [version 2.52 beta 1 build 2004-09-15]

- Sherlock [version 2.0]
- VobSubStrip [version 0.11]
- GraphEdit [build 041201]
- MMCompView [version 1.10]
- LameDropXPd [version 3.97b1]
- AVI Fixed [version 2.0b1]
- FourCC Changer
- Bitrate Calculator

ئێستا دێینە سەر چۆنیەتی بەستنەوەی (تەرجومەكە) بە فلیمەكەوە بە بێ ئەوەی هیچ كارێك لە ساق و ئیش كردنی فلیمەكە بكات. واتە هیچ گۆڕانێك بەسەر ( ڕوونی ) فلیمەكە نایەت . بڕوانە وێنەی ژمارە (٢) .



وێنە ٢

لـەپێش دا بـڕۆ بـۆ فرمـانی View پاشـان Options لـە بەشـی خوارەوە . هەر وەك لە وێنەی ژمارە (٣) دا هاتووە . دوای ئەوەی كـە Options هەڵبـژارد دێـین ئـەو كردارانـە ئـەنجام دەدەیـن كـە لەوێنەی ژماە (٣) دا هاتووە بە تەركیزو بێ غەڵەت وە ئەگەر هەر هەڵەیەك ڕوویدات ئەوا تەرجومەكە بەباشی ناكرێت. بڕوانە وێنەی ژمارە (٣)..


وێنە ٣

ئینجا دوای ئەوەی بەرنامەكەمان كردەوە فلیمە بێ تەرجومەكە و فایلەكەی دەكەینەوە وەك لەوێنەی ژمارە (٤) دیارە .



وێنە ٤

دوای ئەوە دەچینە سەر (File) بۆ ئەو کرداری تەرجومە ئەنجام بدەین . بڕوانە وێنەی ژمارە (٥)..



وێنە ٥

دوای ئەوە دەچینە سەر ئەو فوڵدەرەی کە فایلی تەرجومەکەی تێدایە . بڕوانە وێنەی ژمارە (٦)..



وێنە ٦

دوای ئەوە بۆخۆت سەیری ئەو فلیمە بکە کە ئارەزووتە بۆ ئەوەی لە مانای ئەو فلیمە تێبگەیت کە سەیری دەکەیت . بۆ نموونە بڕوانە وێنەی ژمارە (٧) . لەگەڵ هیوای کاتێکی خۆش بۆ ئێوەی بەڕێزو خۆشەویست .




وێنە ٧

# بەرنامەیەكی زۆربەهێز بۆهێنانی ڤیدیۆ بۆ ناوكۆمپیوتەر هەروەها بۆكاری مۆنتاج VideoImpression2

## بەشی یەكەم



بەرنامەی VideoImpression شتێكی زۆر نایابە بە تایبەتی كە ئێستا كە خەڵكێكی یەكجار زۆر كامێرای ڤیدیۆیان هەیە و هەر ئەو كەسانەش ئامێری كۆمپیوتەریان هەیە لەماڵەوە ئنجا بۆ ئەوەی ئەو پارچە ڤیدیۆیەی كە وێنەی گیراوە خۆت بتوانی دەست كاری و مۆنتاژی بۆ بكەیت پێویستمان بەم بەرنامەیە دەبێت هەرچەندە بەرنامەی تریش زۆرن كە ئەو كارە دەكەن بەڵام ئەم بەرنامەیە كارێكی جوانمان بۆ دەكات و شێوازی بەكارهێنانیشی ئاسانە بۆیە لە ڕێگای ئەم بەرنامەیە هەر چ جۆرە كارتێكمان هەبێت دەتوانین تەلەفزیۆن بگوازینەوە بۆ ناو كۆمپیوتەر هەروەها لە كاری مۆنتاج زۆر سەركەووتوانە دەتوانرێ بۆ ئەو مەبەستە بەكار بهێنرێت كە دەتوانیت لەناو یەك بەرنامە تێكرای مۆنتاج تەواو هەبێت واتا باگراوندو جولەو دەنگ و چوارچێوە واتا تۆ ئەگەر پارچە ڤیدیۆیەك تۆمار بكەیت بۆ ناو كۆمپیوتەرەكەت دەتوانیت بە جوانترین شێوە مۆنتاجی بكەیت ئینجا چ لەڕووی باگراوەند و یاخود گۆرینی ڕەنگی ڤیدیۆكە یان هەرشتێك بێت دەتوانیت بەجوانترین شێوە مۆنتاجێك بەدەست بێنیت لەم بەشەدا تەنها باس لە چۆنیەتی هێنانی تەلەفزیۆن یاخود سەتەلایت یان هەر ڤیدیۆێك بۆ ناو ئەو بەرنامەیە دەكەین سەرەتا پاشكردنەوە و پاش دابەزاندنی بەرنامەكە دێیت بەرنامەكە دەكەیتەوە بڕوانە وێنەی ژمارە ١



سەیری ناوەڕاستی بەرنامەکە بکە سێ نوسراو هەیە ئێمە لەم بەشەدا تەنها پێویستمان بە نوسراوی ناوەڕاست دەبێت کە بریتیە لە Great a New Video کلیکێکی لەسەردەکەین لیستی دووەم دەبێتەوە لەم لیستەش Capture From Divice لێدەدەین وێنە ٢




ئنجا دواتر لیستێکی تر دەکرێتەوە کە دەتوانرێت لەم بەشەوە پارچە ڤیدیۆیەك تۆمار بکرێت و لە ناو ئامێرەکە بپارێزرێت ئنجا دواتر دەتوانرێت کاری مۆنتاژی بۆ بکرێت بڕوانە وێنە ژمارە ٣



لەم لیستەدا تەنها پێویستمان بە ڕیكۆرد دەبێت كە هێماكەی سورە بەڵام لەژێر شاشەكە كە یەكەمیان Settings كە بۆ زیادكردنی ڕەنگی ڤیدیۆ بەكاردێت لەگەڵ ڕەونەقی و ئاڵ كردن و لێڵ كردن بەكاردێت بڕوانە وێنەی ژمارە ٤



وێنەی ٤

هەروەها دوەمیان format ە كە بۆ گەورەیی و بچووكی قەبارەی ڤیدیۆكە بەكاردێت وێنە ٥ هەروەها سێیەم بریتیە لە in put كە بۆهێنانە ژورەوەی ڤیدیۆیە بە هەڵبژاردنی video composite In :١دەبێتە AV هەروەها بەهەڵبژاردنی VIDEO TUNER IN: ٠ تەلەفزیۆن دێتە ناو كۆمپیوتەر پاشان ڕیكۆرد دەكەین تابمانەوێ ئنجا ڕیكۆرد لێدەدەیت تابتەوێ تۆماردەبێت بڕوانە وێنەی ژمارە ٥ .



وێنەی ٥

# بەرنامەی كیل دۆكس
# KILL DOCS

ئا/ ئازاد كەركوكی

زۆر جـــار دەنـــاڵێنین بـــە دەســـت خاوبوونـــەوەی كۆمپیوتەرەكانمانـــەوە لـــە هەنـــدێ بـــارودۆخ كـــە ئـــەو خاوبوونەوەیـە دەگەڕێتـەوە بـۆ زیـاد بوونـی بڕێكـی زۆر لـە فایلاتی كاتی و فایلاتی زیاد كە سیستەم پێویستی پێی نیە و ئـەو وە ئـەو فایلاتـە زیادانـە دەبێتـە داگیركردنـی بڕێكـی زۆرلە ( ڕامی ) كۆمپیوتەر• باشترین بەرنامە بۆ ئەم حاڵەتـە ( KILL DOCS) ە كـە لـە بەشـی ( Tools ) لـە كۆلێكـشنی ( العملاق ٦ ) دا هەیە چۆنیەتی دابەزاندنی بەم شێوەی لای خوارەیە:-



وێنە ١

دوای سـێتاپ كردنـی بەرنامەكـە شـێوەیەكەت بـۆ دەردەكەوێت لەو شێوەیەدا چەند هەڵبژاردەیەك هەیە بۆ بەردەوام بوون لەسەر دامەزراندنی بەرنامەكە لە ناو ئەو چوار گۆشەیەی كە بۆت دەركەوتووە كلیك بكە لەسەر فەرمانی (Next) . بڕوانە وێنەی ژمارە ١



وێنە ٢

بۆ بەردەوام بوون لەسەر دامەزراندنی بەرنامەكە شێوەیەكی ترت بۆ دەردەكەوێت لەو شێوەیەدا چەند هەڵبژاردەیەك هەیە دیسان بۆ بەردەوام بوون لەسەر دامەزراندنی بەرنامەكە لە نـاو ئـەو چـوار گۆشـەیەی كـە بـۆت دەركـەوتووە كلیـك بكـە لەسەر فەرمانی (Next) . بڕوانە وێنەی ژمارە ٢



وێنە ٣

دوای كلیـك كـردن لەسـەر فـەرمانی Next بـۆ دووەم جـار دیـسان جـارێكی تـر شـێوەیەكی وەكـوو پێـشووت بـۆ دەردەكـەوێت ئـەم جارەیـان بـۆ بـەردەوام بـوون لەسـەر دامەزراندنی بەرنامەكە لە ناو ئەو چوار گۆشەیەی كە بۆت دەركـەوتووە كلیـك بكـە لەسـەر فـەرمانی (Install) . بڕوانە وێنەی ژمارە ٣

دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی ( Install )شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێت ئنجا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەواو بەرنامەکە دابمەزرێنین کلیك بکە لەسەر فەرمانی ( Complete ) پاشان کلیکێکی تر لە سەر (Next ) دەکەین بۆ دابەزاندنی بەرنامەکە بۆ ناو ئامێرەکە و بۆ ئەوەی بتوانین لەسەر ئەو سیستەمە کار لەسەر بەرنامەکە بکەین بڕوانە وێنەی ژمارە ٤ .


وێنە ٤

دواتر کلیك دەکەین لەسەر فەرمانی (Install) بۆ دامەزراندنی بەرنامەکە و لە کۆتایی دامەزراندنی بەرنامەکەش دوا فەرمانمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەویش فەرمانی ( Finish) ە بە کلیك کردن لەسەر ئەو فەرمانە کۆتایی دێنین بە دامەزراندنی بەرنامەکە بۆ سەر سیستەمی کارکردنی ویندۆز ئنجا دەچینە سەر ئەوەی کە چۆن کار لەسەر بەرنامەکە بکەین بڕوانە وێنەی ژمارە ٥


وێنە ٥

دوای تەواو بوونی دامەزراندنی بەرنامەکە و دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی( Finish)سیستەمەکە داوای ڕیستارت کردنی کۆمپیوتەرەکەمان لێ دەکات ئنجا دوای ئەوەی کە سیستەمەکە ڕیستارت دەبێتەوە ئنجا بەرنامەکە دەکەینەوە و کلیك دەکەین لە سەر Kill Docs ئنجا دەبینین ئەو فایلاتانەی لە ڕیسێنت دۆکۆمینت دا هەیە هەموویان دەسڕێتەوە وە بڕێکی زۆر (RAM) مان بۆ دەگەڕێتەوە بڕوانە وێنەکانی ٦ - ٧ - ٨


وێنە ٦



وێنە ٧



وێنە ٨

# كۆمەڵەی ئەو بەرنامانەی كە پێویستن لە ناو كۆمپیوتەر هەبن

شنه حسن رانیه

فۆرمات كردنی كۆمپیوتەر دەبێتە هۆی لەدەست چونی تەواوی بەرنامەكانی كۆمپیوتەر دوبارە دامەزراندنی سیستەم نابێتە هۆی گەرانەوەی بەرنامەكان . ئەوەی شایانی باس بێت هەموو كۆمپیوتەرێك پێویستی بە كۆمەڵێك بەرنامە هەیە كە بە بەردەوامی لەناو كۆمپیوتەر بونیان هەبێت بۆ ئەوەی هەر كاتێك پێویستت بە كردنەوەی هەر فایلێك هەبوو بتوانیت بیكەیتەوەو توشی كێشە نەبێت . بۆنمونە تۆ فایلێكی پی دی ئێفت PDF هەبێت ئەگەر بەرنامەی خوێندنەوەی كتێبە ئەلیكترۆنیەكانت نەبێت ئەوا ناتوانیت ئەم فایلە بكەیتەوە . یان كاتێك هەر كەسێك كۆمپیوتەرەكەت بۆ فۆرمات دەكات یا تەنها سیستەمت بۆ دانەمەزرێنێت بەڵكو داوابكە كە تەواوی ئەم بەرنامانەت بۆ دامەزرێنێت . مەبەستمان ئەوەیە ئەم بەرنامانە بەرنامەی بنەرەتین و پێویستە لەناو هەموو كۆمپیوتەرێك هەبێت وە ئەگەر ئەم بەرنامانەی تیا نیە ئەوا پێویستە بۆی دامەزرێنیت چونكە بەم بەرنامانە كۆمپیوتەر لە كردنەوەی فایلەكان و لە پارێزگاری كردن و لە كاركردندا نمونەیی دەبێت . گرنگترین ئەو بەرنامانەش :

١. JAVA SOFTWARE :هەر فێرژنێك بێت ئەم بەرنامەی بۆ كارپێكردنی هەندێك لە بەرنامەكانی گفتوگۆكردن و بەرنامەكانی یاریكردن پێویستن وەكو شەترەنج .

٢. Microsoft .NET Framework version 2.0 : ئەم بەرنامەیە گرنگە بۆ پاڵپشتی كردن لە كردنەوەی هەموو بەرنامەكان كە دادەمەزرێن لە سەر كۆمپیوتەر

٣. DirectX 9.0c End-User Runtime : گرنگە بۆ كاركردنی مەلتیمیدیا و زۆرێك لە یاریەكان بێ ئەم بەرنامەیە كارناكەن .

٤. Adobe Acrobat Reader 7.0 : بۆ خوێندنەوەی پی دی ئێف و كتێبە ئەلیكترۆنیەكان بە هیچ شێوەیەك نابێت كۆمپیوتەر ئەم بەرنامەی تیا نەبێت .

٥. Mozilla Firefox 1.5 : بەهێزترین بەرنامەی بۆ پارێزگاری كردن لە هاتنە ناوەوەی چەتەی ئەلكترۆنی هاكەرەكان و پەرەهەڵدەرەوەی وێب بەكارهێنانی ئەم بەرنامەیە مانای رەتكردنەوەی بەرنامەكانی تری هەڵدەرەوەی پەرەی وێب نیە وەكو ئەنتەرنێت ئێكسپۆرەر .

٦. QuickTime 7 : بۆ كردنەوەی فایلی دەنگ و وێنە .

٧. ZoneAlarm 6.1.137 : بەهێزترین دیواری ئاگرین بۆ پارێزگاری كردنی كۆمپیوتەر لە هاكەرو سیخورەكانی كۆمپیوتەر .

٨. ACD SEE pro بەهێزترین بەرنامە بۆ نیشاندانی وێنە بە جوانترین شێوەو چەندان خزمەت گوزاری .

٩. ACE UTILITIES 3 : بەرنامەیەكی زۆر گرنگ لەم گۆڤارە بەدرێژی باس كراوە ئەم بەرنامەیە بۆ بەرێوەبردنی كۆمپیوتەر گرنگە .

١٠. KASPERSKY ANTIVIRUS 2006 : بەهێزترین دژە ڤایرۆس .

١١. WINZIP 10 بۆ زیپ كردنی هەموو جۆرە فایلێك وە كردنەوەی هەموو فایلێكی زیپ كراو وە زۆر گرنگە كۆمپیوتەر بەبێ ئەم بەرنامەیە ناتەواوە

١٢. Paltalk8.2, Yahoo messenger 7.5، msn messenger : بەرنامەكانی گفتوگۆ كردن چات

١٣. Internet download manager 5.1. یەكێك لەبەرنامەكانی داونلۆد . تۆ دەتوانیت هەر بەرنامەیەكی تری داونلۆد دامەزرێنیت .

١٤. Real player 10.5 gold : بەرنامەیەكی زۆر گرنگ بۆ فایلەكانی دەنگی و ڤیدیۆیی

١٥. هەر بەرنامەیەكی دەستكاری كردنی وێنە بێت وەكو فۆتو شۆپ یان فۆتۆ ئیمپاكت هتد

# وێنەگرتنی شاشەی کۆمپیوتەر

ئا : سۆران صالّح
Karnas_86@maktoob.com

وەك ئاشکرایە لای هەمـــووان کـــە نهێنی یەکانی(windows xp) هێندە زۆرن کە هەر جارە و نهێنی یەکی تری ئەو سیستەمە دەدۆزرێتەوە و ئاشکرا دەبێت لەلایەن بە کارهێنەرانی یە وە... منیش لێرەوە دەمەوێت کە خوێنەرانی ئەم گۆڤارە خۆشەویستە بە نهێنی یەکی تری ئەم سیستەمە ئاشکرا بکەم، کە بریتی یە لە وێنەگرتنی شاشەی کۆمپیوتەر. بەڕیزان زۆرجار ئێمە بۆ وێنە گرتنی شاشەی کۆمپیوتەرەکەمان پەنادەبەینە بەر بەکارهێنانی یە کێك لەو بەرنامانەی کە ئەم کارەمان بۆ ئەنجام دەدات، بەبێ ئەوەی کەبزانین(windows xp ) ئەو خزمەتگوزاریەی بۆ ئامادەکردووین ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە: سەرەتا ئەو بەرنامەیەی کەدەمانەوێت وێنەی بگرین دەکەینەوە(وێنەی١) پاشان بۆ وێنە گرتنی پەنجە دە نێین بە دوگمەی (print screen sysrq) لەسەر(keyboard) ئینجـا بۆ هێنانـی وێنەکە دەچین بەرنامـەی (paint) دەکینەوە (وێنەی٢) لەلیستی (Edit) کرداری(paste) هەڵدەبژێرین کە چالاك بووە(وێنەی٣) دەبینین وێنەکە دەبێتەوە. (وێنەی٤). وەهەروەها ئەگەر بمانەوێت تەنها وێنەی(box)ی چالاك بکرین ئەوا لە هەمان کاتدا پەنجە لەسەر هەردوو دوگمەی (alt+print screen) دادەگرین ..


وێنە ١



وێنە ٢



وێنە ٣


وێنە ٤

# سیخوڕی کـــــردن

کامەران محمد - شەقلاوە
Kameran7605@yahoo.com

سیخوڕی بە شێوەیەکی گشتی بریتی یە لە توانای گەیشتن بە ئامانجێکی دیاری کراو بە شێوەیەکی نا شەرعی ، لە ڕێگای کەلێنەکان لە سیستەمی خۆ پاراستنی تایبەت بە ئامانجەکە ، کاتێك ئێمە باسی سیخوڕی دەکەین بە شێوەیەکی گشتی باس لە توانی کەسی سیخوڕ دەکەین لە چوونە نێو ئامێری کۆمپیوتەری کەسێك ، بەدەر لەو زیانانەی کە دروست دەبن ، کاتێك هەڵدەستیٚ بە چوونە نێو ئامێرێکی تر ئەوا پیٚ ی دەوتریٚ سیخوڕ (Hacker) ، بەڵام کاتێك هەڵدەستیٚ بە سڕینەوەی فایلێك یاخود کارکردنی ئەوا پیٚ ی دەوتریٚ تێکدەر ( Cracker ) .

## سیخوڕی چۆن دەکرێت ؟

دزە کردن بۆ ناو ئامێرێك وەکو دزە کردنە بۆ نێو هەر شتێك ، چەند بنەماو ڕێگایەکی هەیە کە کەسی هاکەر دەتوانیٚ بچێتە نێو ئامێری کەسانی تر ، لەرێی شارەزایی کەلێنەکانی هەن لە سیستەمەکە ، وە بەگشتی ئەو کەلێنانە هەن لە ڕێچکەکانی ( ports ) تایبەت بە ئامێرەکە ، وە دەتوانین بە کورتی پێناسەی ئەم ڕێچکانە بکەین کە بریتین لە چەند دەرگایەکی ئامێرەکە لەگەڵ ئینتەرنێت ، بۆ نمونە ڕێچکەی ٨٠ بەگشتی تایبەت کراوە بۆ پێش کەشکردنی خزمەتگوزاری لەچوونە نێو ئینتەرنێت لە لای بەکارهێنەر ، وە لەهەندیٚ کاتدا ڕێچکەی ٨٠٨٠ دەبێت ، چەند ڕێگایەك هەن بۆ سیخوڕی کردن ئاسانترینیان بۆ سەرەتاکان کە بەکاری بهێنن ، بریتی یە لەو بەرنامانەی کە پشت دەبەستن بە سیستەمی ( سێرڤەر / مەعمیل) ( server/client ) ، کە پێك هاتووە لەدوو فایل یەکێکیان server کەوا دەینێرێت بۆ ئامێری تووشبوو ، وەئەوەی تریان client کاری پیٚ دەکریٚ لەلایەن هاکەرەکەوە بۆ دەست بەسەراگرتنی ئامێرە تووشبووەکە ، وە لە کاتی ئیش پێکردنی فایلی SERVER لەلایەن کەسی هاکەرەوە ئەوا ئامێرەکە ئامادە دەبێت بۆ دزە کردن ،ئەویش یەکردنەوەیەك لە ڕێچکەکانی ١٢٣٤٥و ١٢٣٤٦دەبن ،و لە ڕێگای بەرنامەکانی تایبەت بەو کارە وەکو NETBUS,NETSPHERE,BACKORIFICE دەتوانیٚ چی بیەویٚ بیکات ، وە کەسانی تریش دەتوانن هەمان شت بکەن کاتێك هەڵدەستن بە سڕینەوەی ڕێچکەکان (port scanning) وە دەبینین ڕێچکەکە کراوەتەوە ، ئەمەیان ئاسانترین شێوەی سیخوری کردنە .

## چۆن بەرەنگاری سیخوڕی دەبیتەوە ؟

لەهەنگاوی یەکەم دا دەبیٚ ئەوە بزانی کە تۆ تا پەیوەند بیت بەتۆڕ (online) ، بیٚ گومان ئامادەی تووشبوونی بەدزە کردنە نێو ئامێرەکەت ، لەهەرکاتێك و بەهەر ڕێگەیەك بێت ، لەبەر هۆکارێك بێت یاخود بیٚ هۆکار ، وە لەوانەیە ئەو کەسە ( هاکەر ) شارەزا (expert) بێت بەوەی بتوانیٚ دزە بکاتە نێو ئامێرەکەت بیٚ ئەوەی تۆ ئاگادار بیت ، لەبەرئەوە باشترین ڕێگا بۆ خۆ پاراستن ئەوەیە هەرچی بابەتی گرنگ و تایبەتیت هەیە نەیخەیتە نێو ئامێرەکەت ، وەکو کارتی بانك و ووشەی نهێنی ، و ڕێگایەکی چاکتر ئەوەیە ئامێرێکی تایبەت بەکاربهێنیت بۆ پەیوەندی ئینتەرنێت ، کە هیچ زانیارییەکی گرنگی تیا نەبێت ، کە لەوانەیە ئەم ڕێگایە لەڕووی داراییەوە قورس بێت ، بەڵام ئەمەیان باشترین چارەسەرە ، وە هەروەها چەندین بەرنامە هەن بۆ بەرگری کردن

لەسیخوڕی و هاکەرەکان ، بەلاّم کارەکەیان بە گشتی تەواو زامن نی یە ، بەلاّم باشە بەکارهێنانیان بۆ وەدەرنانی هەندیٚ هاکەر نەوەکو شارەزاکانیان ، وەکو بەرنامەکانی (Mcafee virus scan last update) و ( Norton anti virus last update) ، کە بەرگریەکی چاکت دەکەن لە فایلەکانی سیخوڕی و بە ڤایرۆسیان دائەنێت ، وە هەروەها بەرنامەی ترهەن تایبەت بە بەرگری لە هاکەرەکان وەکو بەرنامەی lookdown 2000 ، net buster ، intruder alert99 .

## چەند خاڵێکی گرنگ

ئینتەرنێت دانراوە بۆ سوود وەرگرتن و زانیاری گۆڕینەوە ، لەبەرئەوە کارێکی قێزەوونە بەکارهێنانی بۆ زیان گەیاندن بە کەسانی ترو دزینی زانیاری . فیز مەکە کە توانایەکی بەهێزت هەیە بۆ بەرگری لە ئامێرەکەت ، چونکە هەموو کات ئەوە بزانە کە کەسی زیرەکتر هەیە لەتۆ . هەموو پەیوەندییەکی تۆڕ چاوەڕوانی دزەکردنی لیٚ دەکرێت ، هەتا تۆڕەکانی ناوچەییش (Intranet ) . هەولٚ بدە بەردەوام ووشەی نهێنی بگۆڕیت . باشترین ڕێگا بۆ خۆپاراستن و بەرگری کردن ئەوەیە کە کاری دزەکردن و سیخوڕی کردن قوڕس و گران بکرێت .

## ئاگـــــــاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر وئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارانەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر ودەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانەیە.

هەولێر . کورستانی عێراق / ناو بازاڕ بەرامبەر دەرگای قەلاٚ باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی نووسینگەی گۆڤاری کۆمپیوتەر یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن: ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی کۆڕەك: ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان بە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی:

E-mail: aras_co_center@yahoo.com
E-mail: computer_magazine_2005@yahoo.com





# نهێنییەکانی ویندۆز

ئا:کاروان ئەسعد عبدالله
Karwanasad2@yahoo.com

لێرەدا حەزدەکەم تیشك بخەمە سەر (Administrative Tools) چونکە زۆر نهێنی و شتی بەسوودی تێدایە دەتوانین بەکاریان بێنین ، بەڵام زۆر بەداخەوە لەزۆری گۆڤارە کوردیەکان بەلاوەنراوە جانازانم لە بەر بێ زانیاریە یاخود لەبەر هەر شتێکی ترە، باس لەوە دەکەم کە چۆن بتوانین کاتێ کە ویندۆز پێدەبێ چوار گۆشەیەك (دایلۆك بۆکسێك،مربع حوار) دەربچێ پێش ئەوەی بچێتە ناو ویندۆزەوە هەندێ زانیاری تایبەت بەخۆمانی تێبکەین وەیان زانیاری لەسەر کۆمپیوتەرەکەمان ، ئەم هەنگاوانەی خوارەوە جێ بەجێ دەکەین :

١. Start Control Panel Administrative Tools Local Security Policy Security Option سەیری وێنەی ژمارە (١) بکە

٢. لەبەشی لای ڕاستی وینەی (١) دوو جار کلیك لە سەر ( Interactive logon: Message text for users attempting to log on) لاکێشەیەکمان بۆ دەردەچێ دەتوانین تێبینیەکانمان لەوێ بنوسین وەك لە وێنە (٢) دیارە

٣. پاشان بۆ نوسینی ناونیشانێك (title) بۆ ئەو لاکێشەیەی کە دەمانەوێ دروستی بکەین ، دەبل کلیك لەسەر (Interactive logon: Message title for users attempting to log on) وەك لە وێنە (٣) دیارە ، باشان (ok) دەکەین

٤. کۆمپیوتەرەکەمان ریستارت (Restart) دەکەینەوە دەبینین پێش چونە ناو ویندۆزەوە لاکێشەیەکەمان بۆ دەردەچێت ئەو تێبینیانەمان بۆ دەردەچێت کە لە سەرەوە نوسیبومان سەیری وێنە (٤) بکە




وێنەی ١




وێنەی ٢




وێنەی ٣




وێنەی ٤

# سیستەمی دۆس (MS-DOS)

ئا : باوکی ماریا
Kameran7605@yahoo.com

## بەشی یەکەم

### DOS چی یە ؟

DOS کورتکراوەی (Disk operating system) ە، واتە سیستەمی کارپێکردنی دیسکەکان، سەرەتای دەرکەوتنی سیستەمی دۆس دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ١٩٨١ وە بەردەوام دەرچووی نوێ ی لێدەرچووە ، وەك دەرچووی 3.0 وە پاشان دەرچووی 6.00 لە ١٩٨٣/٣/١٠، کە نوێکاری زیاتر بوو لە دەرچووی 5 ، وە لە ١٩٩٣/٩/٣٠ دەرچووی 6.21 وە کۆماندی scan disk بۆ زیادکرا، وەلە ١٩٩٤/٣/١٣ دەرچووی 6.21 بەرهەم هات ، وەجیاوازی ئەوە بوو کۆماندی db/spase تیا لابرا بەهۆی ئەو گێچەڵە یاساییەی کە تووشی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بوو لەگەڵ کۆمپانیای stalker.وە دەرچووی 6.22 دەرچوو لە ١٩٩٤/٥/٣١، وە لەدوای ئەمە دەرچووی حەوتیش بەرهەم هات، لەمەوە دۆس بووە یەکەمین سیستەم کە بەکارهێنرا لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر ، ئەمەو ئەم سیستەمە بەردەوام بوو بۆ ماوەی ١٣ ساڵ تا لەکۆتاییدا کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بووە بەرهەم هێنانی پرۆگرامێکی تر کە کاری دۆس و ویندۆس بەیەکەوە کۆبکاتەوە، ئەمەو وە سیستەمی ویندۆز کارئاسانی زۆری تێدایە بۆ بەکارهێنەری کۆمپیوتەر ، چونکە ئەم سیستەمە لەسەر ڕژێمی GUI ئەمیش کورتکراوەی graphic user inter face (واجهة المستخدم الرسومية) بەرهەم هاتووە . بەکورتی دۆس بریتیە لە سیستەمی کارپێکردن وەکو ویندۆز، هەروەها وەکوو هەموو سیستەمەکانی تر، بەڵام ئەم جیاوازییەی کە هەیە بریتی یە لەوەی لەسیستەمی دۆس هەموو فەرمانەکان لەڕێ ی کیبۆرد تۆماردەکرێن، واتە ماوس بەکار نایەت، و فەرمانەکانی ئەم سیستەمە زۆرن و ئەوانەی گرنگن باسیان لێوەدەکەین .

تێبینی / لەوانەیە هەندێ فەرمان لەسەر ئامێرەکەت کارنەکەن، ئەویش بەهۆی جیاوازی دەرچووەکانی دۆس، کەفەرمانەکان لەهەنێکیان کاردەکەن وەلە هەندێکیانیش لابراون ، واتە کارناکەن .

### جیاوازی نێوان سیستەمی دۆس و ویندۆز

1. سیستەمی دۆس دادەنرێت بە بنچینە بۆ سیستەمی ویندۆز .
2. سیستەمی دۆس ئیش پێکەری یەك لایەنیە (single tasking)، واتە دەتوانین یەك بەرنامە ئیش پێبکەین لەیەك کاتدا ، بەڵام ویندۆز ئێش پێکەری چەند لایەنیە (multi tasking)، واتە دەتوانین لەیەك کاتدا کار لەسەر چەندین بەرنامە بکەین .
3. سیستەمی دۆس لەدونیایەکی بێ دەنگ کاردەکات، بەڵام کارکردنی ویندۆز لەدونیایەکی پڕ لەدەنگ و وێنەیە، واتە (graphics user inter face).
4. هەموو ئەو شتانەی دەیبینی لە سیستەمی ویندۆز دەتوانی بەدەستیان بخەیت لەکاتی چاپ کردن (what you see is what you get) .
5. ئاسان کاریەکی زۆر هەیە لە سیستەمی ویندۆز بۆ ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و نووسین، لەنێو بەرنامە پراکتیکیەکان .

لە سیستەمی ویندۆز ماوس دەورێکی سەرەکی هەیە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکان، بەڵام لە سیستەمی دۆس خشتەی کلیلەکان (keyboard) بەکاردێت بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکان .

١.Microsoft drive space . بەهۆی ئەم کۆماندەوە توانای هارددیسکەکە زیاد دەبێت ، چونکە ئەم کۆماندە دەبێتە هۆی کەپس کردنی فایلەکان و دروست کردنی شوێنی بەتاڵ .
٢.Scan disk . بەهۆیەوە هەڵدەستین بە چێك کردنی وپشکنینی هاردیسکەکە ، وەئەگەر هەر گێژەڵێك (error) هەبێت دەتوانێ ڕاستی بکاتەوە .
٣.Microsoft memmaker . دەبێتە هۆی گواستنەوەی پارچە درایڤەکان و یادی بەکارهاتووی پرۆگرامەکان لەبەشی conventional memory بۆ بەشی upper memory
٤.ms-back up :- دەبێتە هۆی بە یەدەك کردنی زانیاری یەکان .
٥.ms-Anti virus :- دەبێتە هۆی ناسینەوە و لابردنی ڤایرۆس .
٦.ms-un delete :- کارئاسانی دەکات بۆ گەڕانەوەی ئەو زانیاری یانەی کە سڕاونەتەوە .
٧.config.sys :- ناسینەوەی زیاتر لە کۆنفیگرەیشن .
٨.Deltree :- سڕینەوەی دایرێکتەرەکان دەگرێتەوە .
٩.ms- defragment :- ڕێکخستن و گونجاندنی فایلەکان .
١٠.ms- diagnosis :- دەبێتە هۆی نیشاندانی زانیاری تەکنیکی لەسەر کۆمپیوتەرەکەت .
١١.inter link :- گواستنەوەی زانیاری لەنێوان دوو کۆمپیوتەردا .
١٢.move , copy , xcopy :- گواستنەوەو لەبەرگرتنەوەی زانیاری و کۆپی کردنی دایرێکتەری .
١٣.disk copy :- لەبەرگرتنەوەی دیسکێکە بەهەموو زانیاری یەکەوە بۆ دیسکێکی تر .
١٤.dir , men , format :- دیارخستنی زانیاری یەکان و بڕی یاد و سفرکردنەوەی دیسکەکان .
١٥.choice :- لێرەدا پرسیار دەکات لە یوزەر کە لە چ کاتێکدا batch program ڕەن بکات .

## چۆنیەتی پێکهێنانی پرۆگرامی دۆس

زۆربەی ئامێرەکانی کۆمپیوتەر خۆگرنجاندنێکیان هەیە لەگەڵ ms-dos وە زۆر بەئاسانی دەتوانین دۆس setup بکەین .
پرسیار / ئایا لەسەر دسکەکانی دۆس کۆماندەکان کاردەکەن ؟ بۆ ؟
وەڵام / نەخێر، چونکە ئەو فایلانەی لەسەر دسکی دۆسن کەپس کراون وەناتوانن کۆماندەکان کاربکەن، لەبەرئەوەی کرداری setup دەبێتە هۆی کردنەوەی فایلەکان و کۆپی کردنیان لەسەر فۆڵدەری دۆس کەلەسەر درایڤی هارددسکەکەیە ، وە لە بەشی c دروستی دەکات .

## Command prompt

بریتی یە لە شوێن پێدانی ئەو فەرمانەی دۆس کە دەمانەوێ جێ بەجێ بکرێت لەلایەن دۆسەوە، ئەویش هەرکاتێك کۆمپیوتەرەکەمان داگیرساند ئەگەر سیستەمی دۆس لە کۆمپیوتەرەکەدا هەبوو ئەوا ڕاستەوخۆ ئەم کۆماندە پرۆمپتە بەدیاردەکەوێ بەم شێوەیە c:\> .

فایلە سەرەکیەکانی سیستەمی دۆس

فایلە سەرەکیەکانی سیستەمی دۆس دەکرێن بەسێ بەشەوە :-
1. IO.SYS / ئەم کۆماندە تایبەتە بەیەکەی خستنە ناوەوەو یەکەی دەرکەر .
2. Msdos.sys / ئەم کۆماندە کۆمەڵێکی زۆر فەرمانی تێدایە .
3. Command .com / ئەم کۆماندە کۆمەڵێك فەرمانی ناوەخۆی تێدایە لە سیستەمی ئیشپێکردن .

# بینینی گشت وێنەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت بەبێ جیاوازی لە دیارو نادیار سڕاوەو نە سڕاوە

ئا/ البدری

ڕێگاکانی چونە ناو ئەو گەڕانە .... سەرەتا بچۆ سەر Start پاشان Search لە دواییدا پەنجەرەیەکت بۆ دەکاتەوە کە دەتوانیت لە ڕێگەیەوە بگەڕێیت بەدوای گشت بابەتەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت ، بەڵام ئەوەی کە ئێمە لە لامان مەبەست بێت ئەویش Pictures کلیکی لەسەر دەکەین و ئە ووشانەی تێدا دادەنێین و دوای ئەوە Enter دەکەین و ئیتر خۆی بە دوای دەگەڕێت ..

*.Png;*.Jpg;*.Bmp;*.Pcx;*.Tga;*.Tif;*.Psd*



# کردنەوەی کۆمپیوتەرێك ئەگەر هاتوو (پاسۆردی) لەسەر دانرا بێت

کردنەوەی یان شکاندنی (پاسۆردی) کۆمپیوتەرێك ئەگەر هاتوو ویستمان ئیش بکەین بە کۆمپیوتەرێك و (پاسۆردی) لەسەر بوو . زیاتر بۆ ئەو کەسانەی کە کاری کۆمپیوتەردەکەن و پێویسیان بەم ڕێگایە هەیە بۆ کردنەوەی ئەو کۆمپیوتەرە . بەس برادەران تکاتان لێدەکەن بۆ کاری خراپ بەکاری مەهێنن واتە زیان گەیاندن بە کۆمپیوتەری ئەو کەسەی کە کۆومپیوتەرە کەیتان لەبەر دەست دایە . سەرەتا..

ڕێگای یەکەم دانانی وشەی { award-sw } لەنێوان دوو کەوانەدا هەر وەك دانراوە . کە ڕێژەی سەرکەوتنی ٩٥٪ .

ڕێگای دووەم دەرهێنانی ئەو پاتریە یان ئەو پیلەی کە لە ناو (Motherboard) ئەو کۆمپیوتەرە بۆ ماوەی چەند خولەکێك کە ڕێژەی سەرکەوتنی ١٠٠٪ .

# ئامۆژگاری بۆ بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر

چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەو کەسانەی کە زۆر کۆمپیوتەر بەکار دەهێنن و بە بێ پشوودان بە جەستەو چاوو بیری خۆیان کە زۆر جار بەکارهێنانی دەبێتە هۆی تێکچوونی باری تەندروستی ئەو کەسە .



١.خواردنی شلەمەنی زۆر کە دەبێتە رۆژانە بگاتە (٢) لتر .

٢. دانەنیشت لە ژورێك کە زۆر دووکەڵ و هەوای پیسی تێدا بێت.

٣. زۆر نزیك مەبەرەوە لە شاشەی کۆمپیوتەرەکە ، دەبێت بە لایەنی کەمەوە (٦٠) سم دوور بیت .

٤. بە شێوەیەك دابنیشە کە سەرت بەرزتر بێت لە شاشەی کۆمپیوتەرەکە.

٥. هەموو (١) سەعات جارێك (١٠) دەقیقە پشوو بە خۆت بدە و لەو ماوەیەدا سەیری (دەرەوە یان هەر شتێك کە پشوو بە مێشك و گیانت بدات و بزانی پشووی پێ دەکەیت ) .

٦. ئاتکید بکەرەوە لەو ڕوناکییەی کە لەژوورەکەت دایە .

٧. زۆر بەقوڵی سەیری بابەتێك مەکە کە ببێت هۆی هیلاك کردنی چاوەکانت باشتر وایە هەموو (٥) چرکەیەك چاوت بتروکێنیت .

٨. هەمیشە ئاتکید بکەرەوە لە ڕونی و باشی ڕەنگەکانی شاشەکەت .

# خێرا کردنی کۆمپیوتەر

هەموومان واتە بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر حەز دەکەین کە کۆمپیوتەرەکەمان زۆر خێرا بێت و ئیشمان بە خێرایی جێبەجێ ببێت بۆ یە بەباشم زانی یەکێك لە ڕێگاکانی تان پێ بڵێم کە کۆمپیوتەر خێرا دەکات ، هەرچەندە لەوانە چەندەها ڕیگاو ڕێگای تر هەبێت لەو بابەتە . روون کردنەوەی ئەو ڕێگایە :

سەرەتا بچۆرە سەر Start پاشان Run لە دوایدا بۆکسێك بۆ دەکرێتەوە لە ناوی دا ووشەی (system.ini) بنووسە و Enter بکە ، پاشان بۆکسێکی ترت بۆ دەردەکەوێت کە کۆمەڵێك نوسراوی تێدایە و بەدوای وشەی (386enh) بگەڕێ و ڕێك لە دوای ئەو ووشەیە ئەو نووسینانەی لای خوارەوە وەکوو خۆیان دابنێ و دوای ئەوە (ریستارت) بە کۆمپیوتەرەکەت بکەو دەبینیت کۆمپیوتەرەکەت فەرقێکی زۆری کردووە بە تایبەتی لە فرمانەکانی وەك (page buffer.. و ...load و .SwaPfile و LeWi و view.) . ئاگادار بە لە دانانی ئەو ووشانە چونکە هەر هەڵەیەك دەبێتە هۆی تێك چوونی کۆمپیوتەرەکەت .



```
LoadLocalHigh=1
ConservativeSwaPfileUsage=1
page buffer=1000000kbps
load=1000000kbps
open=1000000kbps
download=1000000kbps
back=1000000kbps
faxmodemfast=1000000kbps
view=1000000kbps
```





# رێگاكانی دروست كردنی كورتكراو shortcut

ئا: بێستون عمر

ئەم كرداره كارئاسانیەكی زۆری تێدایه بۆیه ویستم به درێژی باسی بكەم . رێگای دووەم زۆر ئاسانه بەلاٌم ئێمە دێین چەند جێبەجێكاریەكی لەگەلٌ دەكەین ،بۆ جێبەجێكردنی ئەم كرداری دێین له سەر هەر فۆلدەرێك بێت كه ئارەزومانه شۆرت كەتی بۆ دروست بكەین كلیكی راست دەكەین و پاشان كلیك لەسەر (create Short cut) پاشان لەهەر شوێنێك مەبەستمان بێت دەیلكێنین واتا پەیستی دەكەین . پاشان به ئارەزوی خۆمانه كه ناوەكەی بگۆرین و بەم شێوەی خوارەوەش دەتوانین كارەكانی خۆمانی لەم رێگایەدا كورت بكەینەوه :

١. ئەگەر ویستمان بیخەیەنە ناو فەرمانی (Send to) واتا هەر فایلێكمان هەبو تەنها به كلیك له سەر سێند یەكسەر فایلەكە دەچێتە ناو ئەم بەشەی شۆرت كەتەوه . پەیست كردنیش له ناو فۆلدەری سیند لەم گۆڤاره باسكراوه .
٢. ئەگەر ویستمان له گەلٌ كۆمەلەی بەرنامەكان دابنرێت و لەرێگای كۆمەلەی بەرنامەكان بچیتە سەری وبكرێتەوه. كرداری دانانی هەر فایل و فۆلدەرێك له كۆمەلەی بەرنامەكان لەم گۆڤاره باس كراوه .
٣. پەیست كردنی ئەم فایلەیە لەسەر دیسك تۆپ كه بەرچاوترین و نزیكترین شوێنه . ئەم خزمەت گوزاریە بریتیە له كورت كردنەوەی رێگای گەیشتن به فایلەكان لەشوێنی خۆی ئەمەش بۆ مەبەستی خێرا كاركرن بەكار دەهێنرێت لەسەر كۆمپیوتەر چونكە كاتێك تۆ كۆمپیوتەر چەندان بەش و چەندان فۆلدەره كاتێكی دەوێت تا دەگەیتە ناو فۆلدەرەكە بەلاٌم بەم بەرنامەیە دەتوانیت به ئاسانی به یەك كلیك كردن بچیتە سەر فۆلدەرەكەو زۆر بەئاسانیش هەر شتێكت هەبێت بیخەیتە ناوی یان




دەرببێنیت بەبیٌ ئەوەی كاربكاتە سەر قورسی كارپێكردن ( ئەو بەشە هاردەی كه سیستەمی لەسەره) واتا هیچ له خێرایی كار كردنی كۆمپیوتەر كەم ناكاتەوه چونكه كەتۆ ئەم فۆلدەره شۆرت كەت واتا كورتكراوەت له دیسك تۆپ دانا مانای وانیه ئەم فۆلدەره به تەواوەتی لەسەر دێسك تۆپه بەلٌكو تەنها كورت كراوەكەی لەوێیه و هەموو كاتێكیش قەبارەكەی یەك كیلۆبایتە .

# چەند خاڵێكی گرنگ دەربارەی Windows XP

زنجیره( ١٣ )

كامەران خۆشناو - شەقڵاوە
Kameran7605@yahoo.com

١.لابردنی حاڵەتی Hibernate .

ئەگەر حاڵەتی hibernate بووە گرفتێك بۆ ئامێرەكەت یاخود داگیركردنی بۆشاییەكی زۆر لەهارد دیسك ، ئەوا دەتوانی هەڵسی بەلابردنی ئەم حاڵەتە بەم شێوەیە، لە بەشی control panel دەچینە سەر هێمای power option واتە هەڵبژاردنەكانی پاوەر، وە هەڵبژاردەیhibernation دیاری دەكەین، وە دیاری كردنی خانەی Enable hibernation لادەبەین، دەبێتە هۆی لابردنی حاڵەتی hibernation (وێنەی ژمارە ١) .




وێنە ١

٢.لابردنی چەندین خزمەتگوزاری Services .

چەندین خزمەتگوزاری دەتوانین لایان بەرین لەكاتی كارپێكردنی سیستەمی ویندۆز xp، وە بۆ ناسینی ئەم خزمەتگوزارییانە دوو كلیك دەكەین لەسەر هێمای administrative tools، وە دوو كلیكی تر دەكەین لەسەر (services)، دەبینین لیستێكمان دەداتێ بۆ ئەم خزمەتگوزارییانە ، وە بەتەنها كلیك كردن لەسەر هەریەكێكیان ئەوا شەرحێكمان دەداتێ دەربارەی ئەم خزمەتگوزارییە، وە بە دەبڵ كلیك كردن لەسەریان دەتوانین لەكاریان بخەین یاخود كارپێكردنیان بە شێوەی دەستی لە لیستی جۆری دەستپێكردن (Type Startup)، وە خزمەتگوزارییەكان بریتین لە مانەی خوارەوە (وێنەی ژمارە ٢):-




وێنە ٢

Plug and Play Devices
Host Web Client
SSDP Discovery Services
Application
Fast Alerter
Clipboard
Indexing Service Management
Human Interface Devices
User Switching
Net Meeting
Messenger Net Logon
Help Session Manager
Remote Desktop
Routing QOQ RSVP
Remote Registry
Remote Access
Service universal



وێنە ٣

٣.گەیشتن بە حاڵەتەکانی شاشە .

ئەگەر ئێمە حەزبکەین بگەین بە حاڵەتەکانی شاشە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بۆ نموونە ڕەونەقی ڕەنگی ٢٥٦ یاخود هی تر، ئەوا ئەم ڕێگایە دەگرینە بەر، کلیکی ڕاستە دەکەین لەسەر ڕووبەری شاشە وە properties دیاری دەکەین، وە بەشی setting هەڵدەبژێرین وە کلیك لەسەر هەڵبژاردنەکانی پێشکەوتوو دەکەین (advanced)، وە کلیکی adapter دەکەین وە لەسەر پیشاندانی هەموو شێوەکانی پیشاندانی شاشە(List all modes)کلیك دەکەین، ئێستا دەبینین لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە بەهەموو شێوەکانی شاشە لە جۆری ڕەونەقی ڕەنگی و ڕوونی بینین و نوێ کردنەوەی شاشە(وێنەی ژمارە ٣) .



وێنە ٤

٤.زیادکردنی پرێنتەری تۆڕ لە windows xp .

Windows xp ڕێگامان دەدات بەزیادکردن و پرێنت کردن لە ڕێگای پرێنتەری تۆڕ، کە پاڵپشتی پرۆتۆکۆڵی TCP/IP دەکات، وە ناونیشانێکی IP تایبەتی بۆ دادەنرێت، بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەچین بۆ لیستی start دوایی control panel وە دەبڵ کلیك دەکەین لەسەر printer وە کلیکی add printer دەکەین، لە جۆری پرێنتەرەکان Local printer دیاری دەکەین وە next دەکەین، وە کلیکی دروست کردنی نمرەیەکی نوێ دەکەین (create new port)، وە لە لیستەکەدا TCP/IP Standard port هەڵدەبژێرین، دوایی ویزاردی بەرنامەکە داوای نووسینی ناونیشانی IP ی تایبەتمان لێدەکات بۆ پرێنتەرەکە، وە بەشەکانی تر تەاوو دەکەین بە شێوەیەکی ئاسایی (وێنەی ژمارە ٤) .



وێنە ٥

٥.بەسەرنەچوونی کارکردنی ووشەی نهێنی بۆ هەموو بەکارهێنەران .

ئەگەر وویستمان کارکردنی ووشەی نهێنی بەسەرنەچێت بۆ گشت بەکارهێنەران ئەوا ئەم فەرمانەی لە ژێرەوە نووسیومانە دەنووسین لە پرۆمپتی دۆس (وێنەی ژمارە ٥) .

DOS prompt :net accountsmaxpwage:unlimited .

# تەکنیکی کۆمپیوتەرو سینەمایی کوردی

ریپۆرتاژ و فۆتۆ / ڕێناز ئەردەلان بەکر

گۆڕانکاریەکانی بوارە جیاجیاکانی هونەر بە هۆیی بەکارهێنانی تەکنیکی کۆمپیوتەر هونەری سینەماش دەگرێتەوە کە لەگەڵ ئەم تەکنەلۆژیایە ئەم بوارە پێشکەوتنێك و گۆڕانکاریەکی زۆری بەخۆیەوە بینیوە . ئایا سینەمایی کوردی سودی لەم تەکتەلۆژیایە وەرگرتوە ؟ تا چەند توانیویەتی ئەم تەکنیکە بەکار بێنیٚ ؟ ئایا دەرهێنەرانی کورد تاچەند ئاشنان و زانیاریان هەیە لەم زانستە ؟ ئایا چ سودێکی بۆ سینەمایی کوردی هەیە ؟ بۆ ئەم مەبەستە چەند دەرهێنەرێکمان دواند کە ئەوانیش ووتیان :



**سەرەتا هونەرمەند بەکر مەعروف سەبارەت بەم باسە دەڵیٚ :**

سود وەرگرتنی کۆمپیوتەر بۆکاری سینەمایی هەڵبەتە بەهاتن و پەیدا بوونی کۆمپیوتەر هونەری سینەما زۆر سودیان لەم ئامێرە وەرگرتووە لەوانە کاری مۆنتاژ و هونەرکاریەکانی دیکە هەروەها وەرگرتنی چەندین دیمەنی نێو کۆمپیوتەر سود وەرگرتنی ئەم دیمەنانە بۆ دراماو فلیم هەروەها دەرهێنانی ڕێژەی جوڵانەوەی ئەکتەرەکان و بەگوێرەی دیمەن و جوڵانەوەکانی ئەکتەر .

**هونەرمەند صلاح حەسەن دەڵێت :**

وەك ڕوون و ئاشکرایە ئەمرۆ لە دنیایی سینەما کۆمپیوتەر رۆڵێکی گرنگی بینیوە لە ڕووی جوانکاری و گەیاندنی هەموو ئارەزووەکانی دەرهێنەر کاتێك خەریکی کارێکی سینەمایە کە پێشتر واتا لە سەرەتایی سەر هەڵدانی سینەما دەرهێنەر خەیالێکی فانتازی جوانی هەبووە بەڵام نەیتوانیوە جیٚ بە جیٚ بکات لەبەر نەبوونی تەکنیکی کۆمپیوتەر ئەمرۆ لە کوردستان گەر سەیری هەموو بەرهەمەکانی سینەمایی کوردی بکەین دەبینین زۆر بەکەمی توانراوە ئەم ئامێرە بە کار بهێنن لە کارەکانیان یاخود بلێم لە لایەنی ئەنیمەیشن و دروست کردنی فانتازیا لە کارەکان زۆر بەکەمی یاخود هەر نیە ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دوو هۆ یەکەمیان نەبوونی خالێکی فانتازی لە لایەن دەرهێنەر دووەمیش نەبوونی ئەزموونی باش لە زانستی کۆمپیوتەر .





## هونەرمەند فەرزین كریم دەڵێت

ئەگەر ئێستا ئێمە بە ووردی چاوبخشێنین بە توانای خۆمان بۆ بەرهەم هێنانی فلیم دەبینین كە كۆمپیوتەر پتر ڕۆڵی دەبینێت بۆیە ئێمە كاتێك ڕوو لە سیستەمەی دیجیتاڵ دەكەین كە گرێ دراوە بە كۆمپیوتەر بۆیە زۆر هونەرمەند كە لەبواری فلیم كاردەكەن بەتایبەتی ئەوانەی كە لەبواری كورتە فلیم كاردەكەن تەنانەت بەشێك لەوانەی كە لە فلیمی درێژیش كاردەكەن بیر لەوە دەكەنەوە كە بە سیستەمی دیجیتاڵ كار بكەن بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت خۆیان لێرە كاری مۆنتاژ بە كۆمپیوتەر ئەنجام بدەن ئەمڕۆ دەبینین لە بوارەكانی تری فلیمیش وەكو زنجیرەی تەلەفزیۆنی وەك كلیپ وەكو بواری ڕێكلام دەبینین كۆمپیوتەر بە شێوەیەكی زۆر بەرفراوان كاریگەری خۆی پێشان دەدات .



## هونەرمەند عەدنان عوسمان دەڵێت :

بەكارهێنانی كۆمپیوتەر بۆ كاری فلیم لە سینەما هەنگاوێك و داهێنانێكی زۆر گرنگ بوو كە كاریگەریەكی زۆری هەبوو لەسەر چاك كردنی ڕەنگی فلیم و دەستكاری كردنی دەنگەكان و ڕێكخستنی ئێمەش لە كوردستان وەك فلیم سازانی كورد ڕەنگە تا ئێستا سودێكی زۆرمان وەرگرتووە بە حوكمی ئەوەی كە فلیمی (٣٠ ) سی ملیمی سینەمایی ئێمە زۆر كەمتری بەكار دەهێنین كە پێویستی بە كۆمەڵێك تاقی گەوە شوێنی گەورەو سەرمایەی گەورە هەیە كە ڕەنگە بارودۆخی ئەمڕۆی هەرێمی كوردستان نەتوانی ئەم كارە بە ڕێكی جێ بە جێ بكات بۆیە ناچارین پەنا بەرینە بەر كاری دیجیتاڵ كە ئەویش لە ڕێگای كۆمپیوتەر دەتوانی كۆمەڵێك دەستكاری و كۆمەڵێك فێلی سینەمایی كە ئەمەش سودێكی گەورەی هەیە بۆیە هیوادارم لە سینەمایی كوردی دا زیاتر تەكنیكی كۆمپیوتەر بە شێوەیەكی پسپۆرانە بەكار بێت بۆ ئەوەی سینەمایی كوردی بەرەو پێش بچێت .

**لە کۆتـایدا هونەرمەند جوان بـامەڕنی گووتی :**



سینەمایی کـوردی بـە شـێوەیەکی دیـاری کـراو تـەکنیکی کۆمپیوتـەر بـەکار دەهێنێت کـە تـەنیا بـۆ مۆنتـاژ و بـۆ دەسـتکاری ڕەنگەکانـە ئێمـە وەکـو کـورد نـەماتوانیوە کۆمپیوتـەر بـە شـێوە زانـستیانیەکەی لـە بواری سینەمای کوردی بەکار بهێنین چونکە بـۆ نمونـە ئـەو تەکنیکـەی لـە هولیـود بـەکاردێت زۆر زانستیکی پێشکەوتووە لـە چاو ئەو تەکنیکە سادەیەی کە ئێمە بەکاری دێنـــن وەك بەرنامـــەی ( $^{٣}$Dmax) وە هـەروەها بەرنامـەی ( Maya) ئـەم دوو بەرنامەیە زۆر گرنگن کە بۆ نمونە لـە فلیمی ( تایتانیك - سید الخواتم - رۆیال ) بەکار هاتوون کە ئێمە ئەم بەرنامانە بەکار ناهێنین کە ئەو بەرنامانەی بەکارە دەهێنین زۆر کۆنن لە چاو ئەوانەی کە باسمان کرد ئەمەش ئەنجامی ئەوەیە کە دەرهێنەرەکانمان ڕوانیان فراوان نیە لە بەکار هێنانی تەکنیکی کۆمپیوتەر لە سینەمایی کوردی ئەمەش لەبەر ئەوەی کەسی پسپۆر کەمە لەم بوارە خوێندنی سینەمایمان نیە کارەکانیش دەبێت بە هاوکاری کۆمپانیایی گەورەی سینەمایی بن بۆیە هیوادارم خولی تایبەت بکرێتەوە وە کەسی پسپۆر دابین بکرێت لە پێناو هەنگاونانێکی پێشکەوتن خواز لە سینەمایی کوردی .

## ئاگـــــــاداری

داوا لە هەموو خوێنەرانی گۆڤارەکەمان دەکەین ئەگەر هەر بەڕێزێك پێشنیاری یان سەرنجێکی هەیە یان هەر کەم وکوریەکیان بەدی کرد لە گۆڤارەکە با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانەی خوارەوە.

هەولێر . کورستانی عێراق / ناو بازاڕ بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی نووسینگەی گۆڤاری کۆمپیوتەر یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن: ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی کۆڕەك: ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان بە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی:

E-mail: aras_co_center@yahoo.com
E-mail: computer_magazine_2005@yahoo.com

# دروستكردنی ماڵپەڕێك به‌ خۆڕایی به‌ قه‌باره‌ی (١٠٠٠) مێگابایت

ئا: محمد مجید محمود

ئەو ماڵپەرانە زۆرن كە دەتوانین ماڵپەڕێكی تایبـەتی بۆخۆمـان لێ دروسـت بكـەین ، حەزدەكەم لێرەدا ماڵپەڕێكتان پێ ئاشنا بكەم كە دەتوانین پێگەیەكی لێوە دروست بكەین بە قـەبارەی (١٠٠٠) مێگابایـت، جیـاوازی ئـەم ماڵپـەڕە لەگـەڵ ماڵپـەڕەكانی تـردا ئەوەیـە كـە خـۆی لاپـەڕەی ئامادە كراوی تێدایـە ،لەوانـە دەفتـەری میوانـەكان و نامـە ناردن هەروەهـا ژمارەی سەردانی میوانەكانیشی تێدایە ، جگە لـەوەش ڕێكلامێكی كـەمی لەسـەرە . سـەرەتا سایتی (www.own-free-website.com دەكەینەوە و پاشكردنەوەی سایتەكە دەڕۆینە سەر register ، وێنەی (١)



وێنەی ١

دوای كلیـك كـردن پەڕەیـەكی نوێمـان بـۆ دەكرێتـەوە ، بڕوانە وێنـەی ژمـارە (٢) ، كـە فۆرمێكی تێدایـە لـە بۆشـایی یەكەمدا داوای ناوێكمـان لێ دەكـات كـە دەبێتـە ناونیـشانی سـایتەكەمان وە لـە بۆشـایی دووەم دا داوای ووشـەی نهێنیمـان لێ دەكـات وە لـە بۆشـایی سێهەم وچوارەم دا ئیمێڵەكەمان دەنوسین وە لـە بۆشـایی پێنجـەم دا نـاوی وڵاتەكـەمان دەنووسـین وە لـە بۆشـایی شەشـەم دا كاتـی وڵاتەكەمان هەڵدەبژێرین گرنگ نیە هەرچیبێت پاشان كلیك لەسەر register دەكەین.



وێنەی ٢

دوای ئەوە لاپەڕەیەكی ترمان بۆ دەكرێتەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٣) كە لە تەواو بوونی كارەكەمان ئاگادارمان دەكاتەوە داوامان لێ دەكات بۆ چالاك كردنی سایتەكەمان سەردانی ئیمیلەكەمان بكەین. ئێستا بووین بە خاوەنی ماڵپەڕی تایبەتی بە خۆمان ، بۆ نموونە www.muhamad.page.tl هەرچەندە ناونیشانی سایتەكە درێژە بەڵام دەتوانین لە ڕێگەی سایتی www.dot.tk یە وە كورتی بكەینەوە كە لە داهاتوودا باسی دەكەین .




وێنەی ٣



# زنجیرەی ماڵپەڕە کوردیەکانی ئەنتەرنێت
# هونەرمەندان و میدیای کوردی

http://www.kurdsat.tv
http://www.komalah.tv
http://www.metv.dk
http://www.tishktv.net
http://www.rojhelattv.com
http://www.rojavatv.org.uk
http://www.roj.tv
http://zagros.tv
www.hawlati.com
www.awene.com
www.hawal.org
www.xandan.com
www.radionawa.com
www. hewlerpost.com
www.kurdrasan.com

www.rewan.org
http://www.xebat.net
http://www.eduhok.net
http://www.gep-media.com
http://www.arankurd.com]
http://www.kurd.it
http://www.raman-media.net
http://www.azaditv.tv
http://www.jamawar.net
http://www.hewlerglobe.net
http://www.gzing.org
http://www.gulan-media.com
http://www.dimane.com
http://www.shawushka.com
http://www.kovarametin.com

# بەرنامەیێك بۆ دابەزاندنی سایتێك بە تەواوی
# لە ئەنتەرنێتەوە بۆ ئەوەی دواتر بەبێ تۆڕی ئەنتەرنێت پەڕەكانی بكەیتەوە
# meta products

ئا: سەفین ڕەواندزی




١- پاش دابەزاندنی ئەم بەرنامەیە ،دوو كلیك لەسەر ئایكۆنەكە بكە چوار گوشەیەك دێتە سەر ڕووی شاشە . (وێنەی ١ )
لەبۆشایی ژمارە (١) ناوی ئەو سایتەی كە دەتەویت دایبەزینی لەئەنتەرنێت بنووسە پاشان next.



وێنە ١

٢- لەبۆشایی وێنەی ژمارە (٢) ئاستی داونلۆد دیاری بكە. (وێنەی ٢ )

٣- ژمارە ٣ بۆ داونلۆدی هەموو فایلەكانی دیاری كراو (وێنەی ٣ ) ژمارە ٤ بۆ پشت گوێ خستنی نیشان كردنی فایلەكان. ژمارە ٥ بۆ دابەزاندنی وینەكان. ژمارە ٦ بۆ دابەزاندنی دەنگەكان. ژمارە ٧ بۆ دابەزاندنی ڤیدیۆ. ژمارە ٨ بۆ دابەزاندنی ئەرشیف فایلە پەستراوەكان و پاش نیشان كردن nextدابگرە.

٤- پاشان چوار گۆشەیێكی تر دەبینی (وێنەی ٤ ) ژمارە ٩ بۆ دابەزاندنی تەنها دیاریكراوەكان. ژمارە ١٠ بۆ دابەزاندنی سێرڤەری سایتەكە. ژمارە ١١ بۆ دابەزاندنی لە هەرجۆرە سایتێك و پاش نیشانكردن nextداگرە.



وێنە ٢





وێنە ٣



وێنە ٤

٥- پاشان چوارگۆشەیێکی تر دەبینی.    (وێنەی ٥ )

ژمارە ١٢ بۆ دابەزاندنی سایتەکە ئێستا.

ژمارە ١٣ بۆ دابەزاندنی سایتەکە لە کاتێکی تردا.

ژمارە ١٤ بۆ ئامادەکردن و بینینی تایبەتمەندیەکانی بەرنامەکە.

٦- پاشان لاپەڕەی بەرنامەکە دەبینی وەك.    (وێنەی ٦ )

ژمارە ١٥ بینینی ناونیشانی سایتەکە.

ژمارە ١٦ بۆ دابەزاندنی سایتەکە.

ژمارە ١٧ دیاریکردنی خێرایی دابەزاندنی سایتەکە.



# ئیمەیڵ چۆن کاردەکات ؟

ئا: کامەران خۆشناو
Kameran76@walla.com



لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر کەس لە ئێمە کار بە ئیمەیڵ دەکەین ، ئەو دارە سیحراوییەی کە جیهانی بە ڕووی ئێمەدا کردەوە ، وە کارئاسانیەکی زۆری دروستکرد لە بەڕێوەبردنی کارەکان ، وە یەکەم نامەی ئەلیکترۆنی کە کاری پێکرا لە ساڵی ١٩٧١ لەسەر دەستی ئەندازیار Ray Tomlinson ، وە داهێنەرەکەی بریتی بوو لە بەکارهێنانی نیشانەی @ کە نیشانەیەکە بۆ ئەو ئامێرەی کە پەیوەستە بەو کەسەی کە نامەی بۆ دەنێردرێت ، بەڵام ئایا ئێمە لە خۆمان پرسیوە شێوازی کارکردنی نامەی ئەلیکترۆنی چۆنە؟ ، وە چۆن بە خێراییەکی وەکو خێرایی هەورە تریشقە دەڕوات ؟ .

### ئەو قۆناغانە چین کە نامەی ئەلیکترۆنی دەیبڕێت ؟

هەموومان دەزانین کەوا چەند بەرنامەیەك هەن ئەگەر بخرێنە سەر ئامێرێك ئەوا ئامێرەکە دەگۆڕێت بۆ سێرڤەر (server)، لەمەوە e-mail server هەیە کە بۆ ئەوکارە تەرخان کراوە ، لە ڕێکخستن و ناردن و وەرگرتنی نامەکان ، بە شێوەیەکی تر ئەم سێرڤەرانە چاوەڕوانی بەرنامە یاخود کەسانێك دەکەن کە هەوڵی پەیوەندی کردن دەدەن بەدەرچەیەکی دیاری کراو ، کە بریتی یە لەدەرچەی ناردن یاخود وەرگرتنی نامە ، بۆ نمونە hotmail دادەنرێت بە سێرڤەرێك کە حیسابی ملیۆنەها کەسی تێدایە ، وە لە نامەدا سێرڤەر دەناسرێتەوە بەهۆی ئەو ناوەی هەیە لەدوای نیشانەی @ ، وە هەندێ سێرڤەر هەڵدەسن بەکردنەوەی مەلەفێکی TXT بە نێوی هەر بەشدار بوویەك ، کاتێك کەسێك ئیمەیڵێك دەنێرێت بۆ کەسێك ئەوا نامەکە دەنوسرێتەوە لەسەر e-mail client ، کە بریتی یە لەبەرنامەیەکی نامەی ئەلیکترۆنی کە هەڵدەسێ بە وەرگرتنی ئەو نامانە بۆ ئەوەی بەکارهێنەر بیخوێنێتەوە ، بۆ نمونە بەکارهێنەری hotmail دەتوانن بچنە نێو e-mail client لە ڕێگای پەڕهەڵدەرەوەی سایت ، یاخود بەکارهێنانی یەکێك لەبەرنامەکانی نامە وەکو outlook ، گریمان بەرنامەی outlook بەکارهات بۆ نوسینی نامەکە ، وەلەو کاتەدا هەڵدەسێ بە نوسینی ناونیشانی نامەکە لە خانەی TO ، لەمەوە بەرنامەی outlook هەڵدەسێ بە پەیوەندی کردن بە سێرڤەری نامەی ئەو کەسەی بۆی دەنێریت ، وە بەدوای ناوەکەیدا دەگەڕێت لە نێو بنکە زانیاریەکانی سێرڤەرەکە ، ئەگەر بینیەوە ئەوا هەڵدەسێ بە وەرگرتنی نامەکە و ناردنی بۆ ئەو کەسە ، وە هەروەها هەڵدەسێ بە تەئکیدکردنەوە لەسەر هەبوونی بۆشایی پێویست بۆ وەرگرتنی نامەکە ، ئەگەر نا نامەکە ڕەفز دەکرێتەوە . ئەمە فکرەیەك بوو لەکارکردنی نامەی ئەلیکترۆنی ، بەڵام ئایا لەسەر ئەرزی واقیع چ ڕوودەدات ؟ هەرلەو کاتەی نامەکە دەنێردرێت تاوەکو دەگاتە دەستی خاوەنەکەی. لە واقیعدا دوو پرۆتۆکۆلی سەرەکی هەن بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ نامەی ئەلیکترۆنی ، وە زۆربەی سێرڤەرەکانی نامە لەجیهاندا کار بەم دوو پرۆتۆکۆڵە دەکەن ئەوانیش :

>LI dir = rtl>
Smtp server ( simple mail transfer protocol )
>LI dir = rtl >
Pop3 server 9 post office protocol )

یەکەمیان مامەڵە دەکات لەگەڵ ئەو نامانەی دێن لە دەرچەی ( port 25 ) ، وە دووەمیان لەگەڵ ئەو نامانەی دێن لە پلەی ( port 110 ) .

یەكەم // the smtp server

گریمان كەسێك بە نێوی گۆران كە ژمارە بە شداربووی هەیە لە سێرڤەری سایتی hotmail ، دەیەوێ نامە بنێرێ بۆ سیروان لە سێرڤەری سایتی yahoo ، لە ڕێگای بەكارهێنانی یەكێك لەبەرنامەكانی نامەی ئەلیكترۆنی كە بریتی یە لە outlook ، ئایا ئەمە چۆن ڕوودەدات لە ڕێگای دەرچەی smtp ؟

١. outlook هەڵدەسێ بە پەیوەندی كردن لەگەڵ سێرڤەری نامەی hotmail لەڕێ ی دەرچەی ٢٥.

٢. كۆمپیوتەری مەعمیل هەڵدەسێ بەهەواڵ دانی سێرڤەری ئەلیكترۆنی لە ڕێگای پرۆتۆكۆلی smtp ، بەوەی كەوا كەسێكی وەكو گۆران دەیەوێ نامە بنێرێت بۆ ناونیشانی serwan@yahoo.com كە هی سیروانە .

٣. سێرڤەری نامە هەڵدەسێ بە شی كردنەوەی ناونیشانی ئەو كەسەی ناردوویەتی ، كە پێك هاتووە لەدوو بەش :—

- ناوی ئەو كەسەی دەنێرێت كە بریتی یە لە گۆران وە ناو دەنرێت بە recipient name .
- نـــاوی سێرڤـــەری نامە كەلەدوای نیشـــانەی @ دێـــت ، كە بریتـــی یە لە yahoo كە ناودەنرێـــت بە the domain name.

٤. پرۆتۆكۆلی smtp هەڵدەسێ بە چات كردن لەگەڵ the domain name server ی تایبەت بە hotmail.com ، وە داوای ژمارەی (IP)ی تایبەتی سێرڤەری نامەی yahoo.com دەكات .

٥. پرۆتۆكۆلی smtp لە hotmail.com هەڵدەسێ بە پەیوەندی بە yahoo.com لە ڕێی دەرچەی ٢٥ ، بە هەواڵ پێدانی بەناردنی نامەیەك بۆ یەكێك لە بەشداربووانی لە لیستی ناونیشانەكان ، بەو شێوەی نوسراوە بۆی دەنێرێت ، وە ئەویش لەناو خۆیدا هەڵدەسێ بە تەسلیم كردنی نامەكە بە ناونیشانی دیاریكراو ، لەڕێی سێرڤەری پرۆتۆكۆلی pop3 كە ئەوكارە دەكات . وە لەبەر پەستانێكی زۆری نامەی ئەلیكترۆنی بۆ سەر سێرڤەرەكان ئەوا زۆربەی سێرڤەرەكانی smtp بەرنامەیەكـــی بچـــووك بەكاردەهێنن بەنێـــوی sender mail، بۆ ئەوەی بەدواداچوونی كاری ناردنەكە بكات هەرلە پانزە دەقیقەوە تا چوار سەعات ، ئەگەر نا ناردنی نامەكە ئامانج ناپێكێ ، وە هۆكارەكە دیاری دەكات ، بەهۆی سەرقاڵی سێرڤەر یان نەبوونی ئەم ناونیشانە .

تێبینی // ئەگەر ئەو كەسەی نامەی بۆ دەنێریت لەسەر هەمان سێرڤەری نامە بوو ، ئەوا پرۆتۆكۆلی smtp هەڵدەسێ بە گواستنەوەی نامەكە بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی بۆ سێرڤەری pop3 لەسەر هەمان سێرڤەر پاش خاڵی ٣ .

دووەم //the pop3 server

سێرڤەری pop3 كاردەكات وەكو هەڵگری نامە ( ساعی البرید) لە نێو سێرڤەری سەرەكی نامەكە ، واتە كاتێك بەكارهێنەر بەرنامەیەك بەكاردەهێنێ بۆ نامەكان نمونە outlook ئەوا پەیوەندی دەكات لەگەڵ سێرڤەری pop3 لە ڕێ ی پۆرتی 110، كە داوای ناوو ووشەی نهێنی لێ دەكات ، بۆ كردنەوەی حیسابەكەی بۆ بینینی نامەكان .

# yahoo photos و کارەکانی

ئا: هانا خالد شوانی
hanaxalid@yahoo.com

وەك هەمووماں دەزانین لە ژیانی ئەمڕۆماندا ئەنتەرنێت گرینگترین شتە کە ئاسان کاریەکی باشی بۆ کردووین بە پێویستم زانی کە شتێکتان پێ بناسێنم کە ئەویش یاهوو فۆتۆیە کە بەکاردێت بۆ هەڵگرتنی وێنە لە ناو ئیمەیلی خۆت لە یاهوودا کۆمپانیای یاهوو ئاسانکاریەکی وای بۆ کردووین کە ئێمە لە جیاتی (فلۆپی) و یان هەڵگرتنی وینە لەناو کۆمپیوتەرەکەت یان (سی دی)دا ئێمە وێنەکانمان لە ناو (یاهوو فۆتۆس) دادەنێین بە هەنگاوانەی ژێرەوە:

My Photos

Add Photos | Share Album | Order Prints | Print-at-Home | Delete

0 Albums




Welcome to Yahoo! Photos

It's Easy to Get Started

Click on "Create New Album" to start adding photos. Upload as much as you want - you get free, unlimited storage.

Need more help? Check out our Upload Tutorial, a step-by-step guide to uploading digital photos to your account.

0 Albums

Add Photos | Share Album | Order Prints | Print-at-Home | Delete

**وێنەی ژمارە ١**

١. یاهوو دەکەینەوە
٢. لەژێرەوە (Add photos) هەڵدەبژێرین وێنەی ژمارە ١
٣. لێرەدا داوای ئیمەیڵ و پاسوەردەکەت لێ دەکات تۆش ئیمەیل و پاسۆردەکەت بنووسە .
٤. ئنجا ئەو بڕگەیە هەڵدەبژێرین Get started و کلیکی لەسەر دەکەین
٥. دواتر ئەو بڕگەیە هەڵدەبژێرین: Continue to yahoo photos
٦. هەڵدەبژێرین: Add photos و کلیکی لەسەر دەکەین
٧. دواتر بۆ بەردەوام بوون ئەو بڕگەیە هەڵدەبژێرین: Continue وێنەی ژمارە ٢
٨. دواتر دووبارە ئەو بڕگەیە هەڵدەبژێرین: Continue
٩. دوای ئەوە شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا چەند بەشێکی تێدایە کە دەتوانین لە ڕێگایەوە وێنەکان بێنینە ناو ئیمایلەکەمانەوە ئنجا وێنەکان هەڵدەبژێریت لەو شوێنەی کە داتناوە تاکو بینێرین بۆ (یاهوو فۆتۆس)
١٠. دەبینین وێنەکانمان دەچێتە ناو ئەو بەشەوە ئنجا دواتر کلیك بکە لەسەر فەرمانی Add Now وێنەی ژمارە ٣ .

Enter Yahoo! IDs separated by spaces or commas.

Age Restriction
Make this album only viewable by people over 18 More info

Printing restrictions
Do not allow others to print photos from this album More info

Tip: Upload as many photos as you want. You get free, unlimited storage.

Continue Cancel

وێنەی ژمارە ٢

Upload your photos faster! Use the Yahoo! Easy Upload Tool

| | | | |
|---|---|---|---|
| Photo 1 | C:\Documents and Settings\Muhai | Browse... | Preview |
| Photo 2 | | Browse... | Preview |
| Photo 3 | | Browse... | Preview |
| Photo 4 | | Browse... | Preview |
| Photo 5 | | Browse... | Preview |
| Photo 6 | | Browse... | Preview |
| Photo 7 | | Browse... | Preview |
| Photo 8 | | Browse... | Preview |
| Photo 9 | | Browse... | Preview |
| Photo 10 | | Browse... | Preview |

Click "Browse..." to find photos on your computer (JPEGs only). Add Now

وێنەی ژمارە ٣

Photos are uploading... Please wait.

Cancel



# کۆمەڵێك هەواڵی گرنگی پۆستی ئەلیکترونی لە مۆبایلدا

کۆمپیوتەر

Google Images

گۆگل وەکو یەکیك لە بەهیزترین ماڵپەرەکانی ناو ئەنتەرنێت بەردەوام لە خزمەت گوزاری نوێدایە و بەردەوام شتی نویٚ دەخاتە دەست بەشداربوان و ئەو کەسانەی سەردانی دەکەن لە پێشکەوتوترین خزمەت گوزاریدا ماڵپەری گۆگل ڕایگەیاند کەوا ئەوانەی بەشدارن لە پۆستی ئەلیکترۆنی گۆگل دەتوانن زۆر بەئاسانی لەڕێگای مۆبایلەکانیانەوە نامەکانی خۆیان بخوێنەوە . ئەم ماڵپەرە ئەوەشی رون کردەوە کە خێرایی کردنەوەی ئیمەیلیش لە مۆبایل پێنج ئەوەندەی کردنەوەی پۆستی ئەلیکترۆنی خێرا ترە بۆ هەموو ئەو مۆبایلانەش دەبێت کە مۆبایلەکانیان بەرنامەی جافای لەسەر بێت . ئەوەی شایەنی باس بێت یەکێکی تر لە خزمەت گوزاریەکانی ئەم مالپەرە خوێندنەوەی فایلە هاوپێچەکانە لەناو مۆبایلدا واتە ئەگەر نامەکە وێنەیەکی لەگەل هاوپێچ کرابێت ئەوا زۆر بەئاسانی دەتوانی سەیری بکەیت . لە ڕێگای بەرنامەیەکی تایبەت لە ناو مۆبایل بەناوی (Google Mobile). لەگەڵ بلاوبونەوەی ئەم هەواڵەش کۆمپانیای (Sprint Next) ڕایگەیاند کە ئێمەش نەوەیەکی نوی لە جافا دروست دەکەین تاکو بتوانریٚ هەموو ئەم خزمەتگوزاریانەی مۆبایل وەربگرێت و ئاسانکاری تێدا بکات . لەبەر ئەوەی نەوەی ئێستا ناتوانێت ئەم



# پاراستنی كۆمپیوتەری لاپتۆپ

ئا: دەریا حسێن

كۆمپیوتەر وەك ئامێرێكی ئەلیكترۆنی فرە جێبەجێكار چەند ساڵێك لەمەوبەر تەنها دەوڵەت و ئۆرگانە حكومیە باڵاكان خاوەنی بوون پاشان بەهۆی زوو پەرەسەندن و پێشكەوتنی تەكنەلۆژیاو بە پێویست بوونی كۆمپیوتەر لە هەموو دەزگاو ئۆرگان و فەرمانگەو ماڵ و تاكە كەسیش وای لێهات گۆڕانی خێرا خێرا بەخۆیەوە ببینێت تا گەیشتە ئەو رادەی كە كۆمپیوتەری تاكەسی و كۆمپیوتەری بچوك دروست بكرێن بۆ بەجێگەیاندنی كارو فەرمان خەڵك . لەم ڕوانگەیەوە كۆمپیوتەری لاپتۆپ كە مەبەستمان كۆمپیوتەری بچوك و كۆمپیوتەری جانتایی زۆر كەوتە بازارو وە هەموو كەسێكیش دەتوانێت بیكرێت چونكە نرخێكە ئەوتۆی فەرق نیە لەچاو كۆمپیوتەری تر جا لێرەدا لە بڵاوبونەوەی هەرئامێرێك پاراستن و تەمەن درێژی ئامێرەكە رۆڵ دەبینێت چونكە تەمەن درێژی ئامێرێك واتا زۆرترین سود وەرگرتن . ئێمە لێرەدا باس لە پاراستنی كۆمپیوتەر لاپتۆپ دەكەین بەڵام ئەم خاڵانە هەموو كۆمپیوتەرێكی ئاسایی و هەموو ئامێرێك دەگرێتەوە واتە ئێمە با بەس كۆمپیوتەری لاپتۆپ نەپارێزین بەڵكو با هەموو ئامێرەكانمان بپارێزین . گومان لەوەدانیە كە كێشەی گەورە لە ئەنجامی كۆبونەوەی كێشەی وردو كێشە فەرامۆشكراوەكانەوە دروست بونە بۆیە ئێمە تاكو تەمەنی ئامێرەكانمان درێژكەین تاكو ئامێركانمان لە تێكچون بپارێزین پێویستە بەردەوام چاودێریان بكەین لە ناویشیاندا كۆمپیوتەری لاپتۆپە كە یەكێكە لە ئامێرە ناسكەكان بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی كۆمپیوتەریان هەیە بە هیچ شێوەیەك گرنگی نادەن بە شوێنی كۆمپیوتەرەكانیان بەتایبەت كە شوێنەكە پاك بێت وە بەشێوەیەكی زۆر بە نەرمی بەكاریبێنن جا كۆمپیوتەری لاپتۆپ لەهەموو جۆرەكانی تری كۆمپیوتەر توشی تێكچون دەبێت ، ئەمەش بە بێ گوێدانە بە پاك ڕاگرتنی كۆمپیوتەرەكە دوای شەش مانگ كۆمپیوتەرێكی لاپتۆپی بێكەلكت بۆ دەمێنێتەوە لێوارەكانی شكاون كیبۆردەكەی دوگەكانی بەیك نوساون و یان خراپ بونە و مۆنیتەرەكەی چەندن شوخت و هێلی تێكەوتون . وەكو روكاری ئامێرێكی زۆر كۆنی لێدێت . جا لەبەر ناسكی كۆمپیوتەری لاپتۆپ پێویستە پەیرەوی كۆمەڵێك خاڵ بكەین بۆ پاراستنی كۆمپیوتەرەكەمان لەمانە:

١. لەكاتی پاكردنەوەی مونیتەردا بە پاكەرەوەی شوشە وە بە پەرۆیەكی زۆر نەرم كە ڕێژەیەكی زۆر لۆكەی تێدابێت وە بە هیچ شێوەیەك بە پارچە پەرۆی تر پاكی نەكەیتەوە چونكە دەبێتە هۆی روشانی شاشەی لاپتۆپەكە چونكە وەكو لای هەمومان رونە خەوش و روشانەكانی هیچ شاشەیەك چاك ناكرێنەوە وە هەندێ مادە بەكار دێن بۆ چاكردنەوەی روشانی شاشەی مۆبایلەكان بەڵام دەبێت ئاگادارین كە ئەم مادانە بۆ لاپتۆپ بەكار نەهێنن چونكە شاشەی لاپتۆپ زۆر زۆر ناسكەو خەوش و روشانی زیاتر دەبێت .
٢. كیبۆردو پارچەكانی تر پێش سرینەویان پێویستە بە هەوایەكی توند ئەو تۆزو غوبارەی لەسەریەتی لاببرێت و ئینجا زۆر بەنەرمی بسرێتەوەو پاك بكرێتە . بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی تێكچون یان روچونی تۆزو پیسایی بۆ ناو بەشی ناوەوەی لاپتۆپەكە .
٣. بەشێوەیەكی گشتی تۆزو غوبارو پیسایی لەناو سیدی روم كۆدەبێتەوەو بەمەش كاریگەری دەبێت لەسەر تێكچون و سست بونی سیدی رومەكە بۆ ئەم مەبەستەش سیدی تایبەت هەن كە بەو فڵچە وردانەی لەسەریەتی چاوگەكانی ناو سیدە رومەكە پاك دەكاتەوە .

٤. جانتای تایبەتی هەڵگرتنی کۆمپیوتەری لاپتۆپ باشترین پارێزەرە لە روشان و شکان وپاراستنی لە بەربونەوەو یان هەر پێکانێکی لە ناکاو بێت بۆیە هەرگیز لەیادی مەکە کە کۆمپیوتەرەکەت بێ ئەم جانتایە ببەیتە دەرەوە . یان هەر گەشتێك بکەیت .



٥. خاڵێکی تری گرنگ ئەویش بە جێنەهێشتنی لاپتۆپە بە کراوەیی واتە هەرکاتێك کارەکەت تەواو یەکسەر مۆنیتەرەکەی داخە وە سیدی روم بە کراوەیی نەمێنی تا کو تۆزو غوبار نەچێتە بەشەکانی ناوەوە

٦. بە هیچ شێوەیەك هیچ شتێکی گران لەسەر لاپتۆپ دانەنێیت چونکە دەبێتە هۆی کشانی پارچەکان و وە دەبێتە هۆی تێکچون لە کردنەوەو داخستنی مۆنیتەر

٧. خاڵێکی سەرسورهێنەر ماوە کە بریتیە لە لە پیسبون و تێکچونی کۆمپیوتەر بە هۆی مێرو لەبەر ئەوەی لاپتۆپ بۆ هەموو شوێنێك دەگوازرێتەوە بەمەش لە بێ ئاگایی بەکارهێنەرو دانانی لە شوێنی ناشیاو دەبێتە هۆی چونە ژورەوەی مێروو بۆ ناو بەشەوردەکانی کۆمپیوتەرو زیان گەیاندن بە هاردی کۆمپیوتەرەکە بۆیە دەبێت زۆر بەوردی رەچاوی ئەم خاڵە بکەین و ئاگاداری کۆمپیوتەرەکە ببینین وە لەکاتی بەکارنەهێنانی یەکسەر بیگەرێنینەوە ناو جانتاکە ، بۆ ئەوەی لە هەموو مەترسیەکان بپارێزرێن .



# دۆزینـــــەوەی ڤایرۆسێکی نــــوێ

# Win32.Polipos

کۆمپیوتەر

یەکێك لە مەترسیدارترین ڤایرۆسەکانی سالی ٢٠٠٦ دەژمێردرێت یەکەم جار لە ئازارای ٢٠٠٦ دەرکەوت بەلأم ئێستا دوباره چالاك بۆتەوه . کۆمپانیای Doctor Web، Ltd رایگەیاند و بانگەوازی مەترسی سەر هەلدانەوی ئەم ڤایرۆسە بلأوکردەوه . بەپێی دروست کردنی هەموو ڤایرۆسەکان ئەم ڤایرۆسە تایبەتمەندی زور مەترسیداری هەیە چونکە دەبێتە هۆی لەکارخستنی دژە ڤایرۆسەکان وە کار دەکاتە سەر فایلەکانی سیستەمی کارپێکردن ئەویش لەرێگای دروست کردنی چەند کۆدێکی تایبەت کە ڤایرۆسەکە لەناو کۆمپیوتەری توش بوو دەینوسێ (code sections) لەسەر رووبەرێکی بەکار نەهاتوو لە کۆمپیوتەر بەمەش ئەم ڤایرۆسە شوێنێك بۆ خۆی لە ناو کۆمپیوتەر دروست دەکات بەمەش ئەم ڤایرۆسە دەست کاری هەموو بەشەکانی سیستەم دەکات بە ئارەزوی خۆی . بەلأم ئەم ڤایرۆسە ناتوانێت بچێتە ناو ئەم بەشانە:

savedump, dumprep, dwwin, drwtsn32, drwatson, kernel32.dll
smss, csrss, spoolsv, ctfmon, temp

ئەوەی زۆر جێگای مەترسیە ئەم ڤایرۆسە بەردەوام خۆی کۆپی دەکات و هەر بەشێکیش لەم کۆپی کردنە پەیوەست دەبێت بە کارێکی تایبەتەوه . بۆ نمونە یەکێکیان لەگەل تۆری ئەنتەرنێت دەبێت یەکێکیان لەگەل بەرنامەکانی چات دەبێت وە بەم شێوەیە بەردەوام لە تێکدان و لەگەلت دەبێت بەشێوەیەکی بەردەوام و بەشێوەیەکی گشتی لەم چالاکیانەی خوارەوه (API functions) Create Process W, Create File W, Load Library Ex W, Search Path W.

Create Process W, Create File W, Load Library Ex W, Search Path W.

کاتێك دەست کاری هەر بەشێك بکەیت دەبێتە هۆی لەناوچونی بەشێك لە فایلەکانت وە کاتێکیش هەولبدەیت کە بە دژە ڤایرۆس لەناوی ببەیت ئەوا شێوەیەك دروست دەکات کە ناتوانیت هیچ دژە ڤایرۆسێك بیدۆزێتەوه بەم شێوەیە خۆی دەردەخات(ptf*.tmp) بەمەش دژە ڤایرۆسەکان بەسەریدا تێدەپەرن بۆ رێگە گرتن لەم ڤایرۆسە تەنها بەرنامەی (Doctor Web, Ltd) لەگەل کاسپیر سکای دەتوانن رێگر بن لە بلأو بونەوەی ئەم جۆرە ڤایرۆسە و ئەگەر سیستەمەکەش تووشی ئەم جۆرە ڤایرۆسە بوو ئەوە ناتوانیت لەناوی ببەیت تەنها بە فۆرمات نەبێت .






# بیرۆکەی کارکردنی Bluetooth

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
محمد سیامەند تاهیر
سەرچاوە/ موقع المشاغب


وێنەی ژمارە ١/ بەیوەندی بە Bluetooth لە نێوان کۆمپیوتەر و مۆبایل

**بیرۆکەی کار کردنی Bluetooth:**

تەکنەلۆژیای پەیوەندی کردن Bluetooth ی بێ تەل بریتی یە لە کرداری بەستنەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنی یەکان بۆ نمونە ئامێری کۆمپیوتەر و مۆبایل ئامێرە دەنگی یەکان و ستریۆ کامێرا و تەلەفزیۆن و تۆڕی ئەنتەرنێتی بێ تەل (وێنەی ژمارە ١)، بە جۆرێك دەتوانیت لە رێگەی ئەم ئامێرانەوە زانیاری و داتاکان ئالوگۆر بکەیت، بۆ زیاتر پەرە پێدان و بەرەو پێش چوونی ئەم تەکنیکە بێ تەلە گرووپی SIG کە کوورتکراوەی Special Interest Group هەڵسان بە ئەنجامدانی ئەم کارە. لە راستیدا کۆمەڵێك رێگا هەیە بۆ بەستنەوەی ئەم ئامێرانە بەیەکەوە وەك بەستنەوەی کۆمپیوتەر بە بۆردی دوگمەکان (Key Board) و ماوس (Mouse) یان بە ئامێری چاپ (Printer) و سکانەر و کۆمپیوتەرێکی دی، هەروەها بەستنەوەی TV بە ئامێری وێنەگرتن یان سەتەلایت و یان هەر ئامێرێکی ئەلیکترۆنی تر، بێگومان پێویستی بە تەلێکی گەیەنەری تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەوەی بە ئاسانی کۆنترۆڵی پێ بکرێت و دواجار بە هۆی (Remount Control) کە بە (اشعه تحت الحمراو) کار دەکات دەتوانین کۆنترۆڵی ئامێرەکە بکەین . سەرەڕای بوونی ئەم ئامێرانە کە ناسراون بە ئامێرە ئەلیکترۆنی یەکان تاکو ئەمڕۆش بەهۆی تەلەوە بە یەکتر دەگەیەنرێت کە ئەمەش رێگایەکی باوە.

**گرفتەکانی بەستنەوەی ئامێرەکان بە یەکەوە لە رێگای تەلەوە:**

بەستنەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنی یەکان بە یەکەوە پێویستە لە چەند روویەکەوە گونجاو بن،

1. ژمارەی تەلەکانی بەستنەوەی ئامێرەکان؟ هەندێك کات ژمارەی تەلەکان تەنها دووانە وەك بەستنەوەی ستریۆ بە سەماعە و لە هەندێك کاتی تر ٨ تەلەو یان ٢٥ تەلە وەك بەستنەوەی کۆمپیوتەر بە تۆڕی کارەبا.
2. جۆری داتاکان و ئالوگۆری لە نێوان ئامێرەکان؟ چۆنیەتی گۆڕینی زانیاری یەکان و هێماکان تا ئامێرە دەستنیشان کراوەکە هەست بە کار بکات! ئەم جۆرە پەیوەندی یە پێی دەوترێت پرۆتۆکۆل (Protocol) ئەم جۆرە پرۆتۆکۆلانە لە لایەن زۆربەی کۆمپانیاکان کاری پێ دەکەن بۆ نمونە ئامێری ڤیدیۆ لە جۆری Sony لە گەڵ ئامێری TV لە جۆری JVC کار دەکات ئەمەش بە هۆی یەکسان بوونی باری پرۆتۆکۆلەکان لە سەرەتاوە بۆ ئالوگۆر کردنی داتاکان.

**بیرۆکەی بەستنەوەیـ (Bluetooth):**

Bluetooth بریتی یە لەو تەکنەلۆجیا تازە و پێشکەوتووەی کە بە هۆیەوە ئامێرە ئەلیکترۆنی یەکان بە یەکتری دەبەسترێنەوە و زانیاری دەگوازنەوە بە بێ بوونی هیچ تەلێك لە نێوانیان وەك (وێنەی ژمارە ٢)


وێنەی ژمارە2/ بەستنەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنی یەکان بە بێ بوونی تەل

و کۆمپانیا جیهانی یەکانی وەك (نوکیا ، سۆنی ، فیلیپس) رایانگەیاند کە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان کە بتوانن ئامێرەکانی تر کە پێویستن بێ تەل بن ئەم تەکنەلۆجیایەی تیادا بەکار بهێنن بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا ئامێرەکان ئۆتۆماتیکی کار لەگەڵ یەکتردا بکەن هەرچەندە جیاوازی لە نێوانیاندا هەبێت، ئەم تەکنیکە تازەیە کە پێی دەوترێت Near Find Connections واتە (پەیوەنی کردن لە نزیك و لە هەمان شوێن) ئە رێگایە باشترین چارەیە بۆ رزگار بوون لە گرفتی بە یەك بەستنی ئامێرەکان کە رۆژ بە رۆژ لە زیادبووندان، سور شهور کە بەرێوە بەری پرۆژەی (Near Find Connections)ە لە کۆمپانیار Philips رایگەیاند، پەنامان برد بۆ چاکترین رێگا چارە بۆ پەیوەندی کردن لە نێوان دوو ئامێر یان زیاتر تا گەیشتینە ئەنجام و تەکنیکی Bluetoothمان هێنایە ئاراوە و لە هەموو جیهاندا بلاومان کردەوە و بە هۆیەوە دوو ئامێر بە یەکتری پەیوەندی دەکەن هاوپێچی دەنێرن، هەروەهـــا شهور لە درێـــژەی وتەکانی لە BBC Onlineدا گوتی ((پێویستمان بە سەلماندنی ئەم تەکنیکە تازانەیە بۆ ئاسانکاری کارەکـــان لە لایـــەن بە کارهێنەران)). پەیوەنـــدی کردن بە Bluetooth کار دەکات لـــە (٢,٤٥ MHz) مێگا هێرتز ئەم تەرودەدە گونجاوە لە گەڵ ئامێرە زانستی و پزیشکی و پیشەسازی یەکاندا کە وادەکات بە کارهێنانی ئاسان بێت، بۆ نمونە دەرگا سەرەکی یەکانی سوپەرمارکێت بە هۆی (اشعه تحت الحمراء) کار دەکەن کە سەرچاوەکـــەی (IrDA)یە واتە Infrared Data Association ، بەلاّم ئەگەر گۆریمان بۆ Bluetooth ئەوا دەتوانین بە ئامێرێکی تری وەك کۆمپیوتەر کۆنترۆڵی پێ بکەین بەلاّم دەبێت ئەوەش بزانین کە پەیوەندی Bluetooth لەگەڵ ئامێرەکـــان تەنها لـــە دووری (١٠m)دا دەبێت هەرچەندە رێگرێك لە نێوانیدا هەبێت وەك لە (وێنەی ژمارە ٣)،

وێنەی ژمارە3/دووری نێوان ئامێرەکان

با وا دابنێین ئامێرەکانی رۆژانەت هەمووی تەکنیکی Bluetooth یان تیادایە وەك TV و ئامێری DVD و ستریۆ و کۆمپیوتەر و مۆبایل، چۆن ئەم ئامێرانە کە هەمووی Bluetooth یان تیادایە جیادەکەیتەوە؟ وەلاّم:لە کاتێکدا ئەم ئامێرانە پەیوەندی بە یەکەوە دەکەن هەریەکەو تۆرێکی تایبەتی Pico net یان PAN واتە Personal-area network دروست دەکات بۆ نمونە ئامێری کۆمپیوتەر و ماوس کاتێك بە هۆی Bluetoothەوە کار دەکەن واتە ماوسەکەت بێ تەلە ناونیشانێکی (Address) تایبەت لە گەڵ یە کەی سەرو بەرکردنی ناوەندی CPU دا دروست دەبێت بۆ ئەوەی لە گەڵ یە کەکانی تر تێکەڵ نەبێت، بەم شێوەیە ئامێری مۆبایل کاتێك Bluetooth کار دەکات ئامێر هەڵدەستێت بە گەران بە دوای ئە ئامێرانەی کە Bluetoothیان کراوەیە بەم جۆرە تۆرێکی Pico net دروست دەبێت و دەست نیشانی هاندی دیاریکراو دەکەیت و بە هیچ شێوەیەك زانیاری و داتاکان تێکەڵی هاندی تر نابن، بەم شێوەیە ئامێرەکان لەگەڵ یەکتردا پەیوەندی دەکەن و بێگومان لە رێگەی ئەو ئەدرێسانەی کە کۆمپانیا دایناوە بۆ تێکەڵ نەبوون لە گەڵ ئامێرە ئەلیکترۆنی یە جیاوازەکان .

### بۆ چی ئەم تەکنەلۆجیایە بە Bluetooth ناسراوە؟!...

ناونانی ئەم تەکنیکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاشای دانیمارکی هارالّد بلوتوس (Harald Bluetooth) کە دانیمارك و نوروەی یەك خست و ئاینی مەسیحی کردوەتە نێوانیان و لە ساڵی ٩٨٦ لە جەنگیکدا لەگەڵ کورەکەی گیانی لە دەست دا، ئەم ناوە هەڵبژێردرا بۆ ئەم تەکنەلۆجیایە بۆ سەلماندنی ئەو راستیەیە لە جیهاندا کە کۆمپانیا دانیمارك و نوروەی و سویدی و فنلەندیەکان تا چ رادەیەك گرنگی بە کاری پەیوەنی یەکان دەدەن هەرچەندە ئەم ناوە هیچ پەیوەندیەکی بەم تەکنەلۆجیاوە نیە .

# دروست کردنی جۆرێکی نوێ ی مۆبایل لە لایەن کۆمپانیای Palm

ئا: ئیبراهیم خۆشناو
سەرچاوە / www.al-jazirah.net

کۆمپانیای ( Palm ) کە کۆمپانیایەکی پێشکەوتوە لە بواری دروست کردنی ئامێری مۆبایل هەستا بە دروست کردنی جۆرێکی نوێ لە موبایل ( G٣Treo ٧٥٠٧ ) تەنها بۆ تۆڕی ڤۆدافون .

ئەم جۆرە مۆبایلە بە سیستەمی ( os Windows Mobile ٥،٢ ) کار دەکات ، ئەو جۆرە مۆبایلە کە لە لایەن کۆمپانیای ناوبراو دروستکراوە یەکەم جۆرە کە سیستەمی ویندۆز ئیش دەکات ، بەو مواسەفاتانەیە .

* ( ٤ ) چوار شەپۆلی هەیە ئەوانیش (٨٥٠/٩٠٠/١٨٠٠/١٩٠٠) .

*پانی شاشەکەی ( TFT ) بە هەستی دەست لێ خشان کار دەکات .

٢٤٠ K ٦٥ و Pixels ٢٤٠ × Colors .

* تابلۆی دوگمەکانی ( QWERTY ) لە شێوەی تابلۆی دوگمەکانی کۆمپیوتەرە .

* کێشەکەی (١٥٠ ) گرامە .

* کامێراکەی ١,٣ مێگا بیکسل + ڤیدیۆ .

* چارەسەری سامسۆنگ (٣٠٠ ) ( MHZ ) .

* دەتوانرێ گفتو گۆی بە سەماعەی سەر ( Bluetooth) بە بەکارهێنانی فەرمانی دەنگی گفتوگۆی پێ بکرێ.

* میمۆری دەرەکی لە جۆری ( Mini sd) هەیە .

* نامەکان ( mms) ( sms ) هەیە .

*بەرنامەی ( مۆبیل ویندۆز میدیا ( R ) پلەیری (١٠)ی بۆ کارپێکردنی فایلەکانی جۆری دەنگی و ڤیدیۆیی .

هەروەها ئەم مۆبایلە بۆ بەکاربەرانی تۆڕی تەلەفۆنی (ڤۆدافۆن ) لە وڵاتانی وەکو (نەمساو ئەڵمانیا و ئێرلەندا و هۆلەندا و ئیتالیا و ئیسپانیا ) لە کۆتایی ئەمساڵ دەکەوێتە بازارە جیهانیەکانەوە .






# کۆمپانیایەکی ژاپۆنی بۆ دابین کردنی ئاسایش و ئارامی دەرگای وا دروست دەکات کە قسەی لەگەڵ بکرێت

وەرگێرانی لە عەرەبییەوە :
عبدالله سەکتانی

کۆمپانیاکانی داهێنەری ئامێرە تەکنەلۆژیەکانی جیهانی لە پێشانگایەکی تایبەت بە نوێترین تەکنەلۆژیای سەردەم لە بارەی توندو تۆڵکردنی دەرگای ماڵ ئامێری وا دروست دەکەن کە بە سیستەمێکی پێشکەوتوو بەستراو بێت و زاکیرەی تایبەتی بۆ دادەنێن کە بە قسەی مرۆۋ کۆنترۆل بکرێ ، جا یا هەر لە دوورەوە قسەی لەگەڵ بکرێ یان بە هۆی مۆبایل بۆ کردنەوە و قوفل دان .. بە پێ ی ئەو هەواڵانەی کە پەیامنێری دەنگوباسی ئیمارات بلاوی کردەوە لە بالەخانەیەکی زۆر بەرزی پڕ لە دانیشتوان لە (تۆکیۆ)ی پایتەختی ژاپۆن کۆمپانیای ( میتسوی فودوسان تەکنەلۆژیا ) ، ئامێرێکی بۆ خاوەن شوقەکان دروست کردووە تاکو دڵنیا بن ئایا دەرگاکانیان داخراوە ؟ یا کردنەوەی دەرگا لە میوان کە لە پشت دەرگا وەستا بێ هەر چەندە ئەو داهێنانە پێش چەند ساڵێك لەمەو بەر کراوە بەڵام ئەوەی جێگای سەر سورمانە و شایانە باسە لەو پێشانگایەدا کۆمپانیای ( میوا ) سیستەمێکی هاوشێوەی داناوە بەڵام نەك بۆ داخستن و کردنەوەی دەرگا بە هۆی دەنگی مرۆۋ بەڵکو بۆ دانانی نهێنی و ناسینەوەی دەنگی خاوەن ماڵ کە ئەو کارە بەستراوە بە ئامێرێکی وەکوو کۆمپیوتەر تا پەیوەندی کردن بە پۆلیس و وێنەگرتنی ئەو کەسە بە شێوەیەك بکرێت ئەگەر هەستی کرد ئەو دەنگە دەنگی خاوەن ماڵ نییە ... ئەم جۆرە تەکنەلۆژیایانە پێداویستی دانیشتوان دەستەبەر دەکات لە پاراستنی ماڵەکانیان هەر چەندە ژاپۆن لە هەموو وڵاتێك زیاتر ئاسایش باڵی بەسەردا کێشاوە بەڵام تەکنەلۆژیا بیری لە داهاتوو کردۆتەوە بۆ ئەوەی ئارامی و ئاسایش لە داهاتوودا زیاتر گرنگی بدات بە هەموو شوێنێك و هەموو کەسێك لە ماڵەکەی خۆیدا بە ئارامی ژیان بەسەر بەرێت .

سەرچاوە / سایتی گوورە

# ڤایرۆس و کــــرم

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە / شەقڵاوەیی
Kameran7605@yahoo.com
سەرچاوە / www.7lem.com

ڤایرۆسی کۆمپیوتەر (computer virus) /

ڤایرۆس پێناسە دەکرێت بەوەی کە بریتیە لە بەرنامەیەکی بچووک کە هەڵدەستێ بە کۆپی کردنی خۆی، وە پاشان جێبەجێکردنی هەندێ فەرمان، ئەویش یان بە لابردنی بەرنامە ، یاخود گۆرانکاری کردن بە شێوەیەکی نهێنی .

نیشانەکانی تووشبوون /

1. دووبارەبوونەوەی نامە هەڵەیی یەکان لەچەند بەرنامەیەك زیاتر،
2. وە دەرخستنی نامەی خەزن نەکردن بەهۆی نەبوونی بۆشایی پێویست،
3. دووبارەبوونەوەی بزربوونی هەندێ فایلی جێبەجێکار،
4. تووشبوون بە هێواشیەکی زۆر لەکاتی چوونە نێو سیستەم و جێبەجێکردنی هەندێ کردار، قبوول نەکردنی هەندێ کار لەکاتی جێبەجێکار .

جۆرەکانی ڤایرۆس /

چەندین پۆلێن کراون بۆ ڤایرۆسەکان، بۆ نمونە لە خێراییدا هەندێ ڤایرۆس هەن زۆر خێران لە تەشەنەکردندا، کەچی هەندێکیان زۆر لەسەر خۆن، وە لەجێبەجێکردنی کاریاندا هەندێکیان تەوقیت کراون لەکاتێکی دیاری کراو،بەڵام هەندێکیان بەبەردەوامی چالاکن لە تووشبوونی شوێنەکەدا، هەندێ ڤایرۆس تووشی بەشی کارکردن دەبن (Boot Sector) لەسەر دێسکەکان، کە ئەمەیان بەناوبانگترین جۆریانە، وە ڤایرۆسی ماکرۆ (Macro) کە تایبەتە بە تووشبوونی بەڵگەنامەکان و زانیارییەکانی بەرهەمهێنراوی مایکرۆسۆفت ئۆفیس، و لە قەبارەی زەرەر گەیاندندا، هەیانە ڤایرۆسی تێکدەر بۆ ئامێر، وە ڤایرۆسی تێکدەر بۆ بەرنامەکان، وە ڤایرۆسی دیاری کراوی زەرەرەکە، وە هەیانە هیچ زەرەرێکی نیە .

ڕێگاکانی خۆپاراستن /

دابەزاندنی یەکێك لە بەرنامەکانی دژە ڤایرۆس.

پشکنینی فلۆپی دێسك یان فلاش میمۆری پێش بەکارهێنان .

دابەزاندنی بەرنامە تەنها لەسەرچاوەی باوەڕپێکراو .

قەبوڵ نەکردنی هەر فایلێك کە سەرچاوەکەی نەزانراوبێت .

نەکردنەوەی ئەو ماڵپەرانەی کە لە ئەنتەرنێت گۆمانیان لێ دەکرێت یان ئەو ماڵپەرانەی کە کاری بەد ڕەوشتی بڵاو دەکەنەوە کە زۆربەی ئەو ڤایرۆسانە لەو جۆرە ماڵپەڕانەوە دەچێتە ناو کۆمپیوتەرکانەوە .

چارەسەر /

لەکاتی توشبووندا پێویستە کارکردن لەسەر بەرنامەکان ڕابگرین، وە پشت بە بەرنامەکانی دژە ڤایرۆس ببەستین بۆ لابردنی ڤایرۆسەکە، یاخود دانانی سنوورێك بۆ تەشەنە نەکردنی، کەچی هەندێ ڤایرۆسی بەهێز هەن کە ناتوانین بە بەرنامەی دژە ڤایرۆس لای بەرین، بەڵام کۆمپانیای سیمانتك هەڵساوە بەدابین کردنی چەندین ئامێری تایبەت بۆ هەر ڤایرۆسێك، یاخود هەندێ جار داوای لێبووردن دەکات لە جێبەجێکردنی لابردنی ڤایرۆسەکە، بەهۆکاری گواستنەوەی نەخۆشیەکە بۆ بەرنامەی

دژە ڤایرۆس، وەلەم حاڵەتەدا پێویستە هەڵسین بە ئەنجام دانی خزمەتگوزاری گەڕان لەتۆڕدا کە ناسراوە بە (Scan online)، کە هەندێ لەسایتەکان دابینیان کردووە، وەکوو کۆمپانیای سیمانتك .

کرمی کۆمپیوتەر (computer worms) /

کرمی کۆمپیوتەر بریتیە لەبەرنامەیەکی زۆر بچووك، خۆی هەڵدەستێ بە ئەنجام دانی کارەکە، واتە پشت بەهیچ کەسێك نابەستێت، دروست کراوە بۆ هەڵسان بە ئەنجام دانی کاری تێکدان، یاخود بۆ مەبەستی دزینی هەندێ زانیاری تایبەت لە بەکارهێنەران، لەکاتی گەڕانیان بە نێو ئینتەرنێتدا، یاخود زەرەر لێکەوتنیان، لایەنی تری ئەوەیە کەلە تەشەنەکردندا زۆر خێرایە، وە زەحمەتە قوتاربوون لێ ی، ئەمیش بەهۆی خۆگۆڕینی بە چەندین ڕەنگ و کۆپی کردنی .

ئالیەتی کارکردنی /

کرمەکانی کۆمپیوتەر لەکارکردندا لەیەکتر جیاوازن، هەیانە هەڵدەستێ بە کۆپی کردنی خۆی بۆ چەندین ژمارە، ، وە هەیانە تایبەتە بەکاری ئیمەیڵ،ئەمیش بەناردنی خۆی بە نامە بۆ چەندین ناونیشان لەدەفتەری ناونیشان ، کە ئامادەیە لەنێو ئیمەیڵی ئەو کەسەدا، یاخود هەندێکیان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەنێردرێت بۆ چەندین کەس بەناوی خاوەنی ئیمەیڵەکە وە بە ئیمزای ئەو .

ترسناکیەکەی /

ترسناکی کرمەکان بەمە بەدیاردەبێت کە سەربەخۆن، وە پشت بەهیچ بەرنامەیەکی تر نابەستن، کە بێگومان هەندێکیان لە ئەوپەڕی ترسناکی دان، هەتا هەندێکیان بوونەتە کابووسێك لەبەرامبەر بەکارهێنەرانی تۆڕی ئینتەرنێت، وەکو کرمی Tanatosی بەناوبانگ، کەبەدیارکەوت لەمانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٢، کە لەدوای خۆی تێکدان و ئاسەوارێکی زۆری بەجێ هێشت .

ڕێگای خۆپاراستن /

وەکو ئاشکرایە گەورەترین هۆکار بۆ بڵاوبوونەوەی کرم ئیمەیڵە تەوقیت کراوەکانن، کەوا زۆربەی جار ناونیشانی ئەم جۆرە نامانە ناونیشانی سەرنج ڕاکێشن ، وەکو بانگەشە کردن بۆ بینینی وێنەی هونەرمەندێك، لەبەرئەوە پێویستە ئاگاداربین هەتا ئەگەر نامەکە لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراویش بێت .

چۆنیەتی خۆپاراستن /

دەتوانرێ خۆ بپارێزرێ لەکرمی کۆمپیوتەر بە دابەزاندنی بەرنامەکانی تایبەت بە خۆپاراستن لەکرم، وەمو بەرنامەی Worm Guard کە دەتوانین دای بەزێنین لەم لینکەدا، http://wormguard.diamondes.com.au، یاخود دەتوانرێ پشت بەیەکێك لەبەرنامەکانی دژە ڤایرۆس ببەسترێت وەکو بەرنامەی Norton و Mcafee .

# پرێنتەری سۆنی

کۆمپیوتەر

سونیّ بەم دوایانە داهێنانێکی تازەی کۆمپانیاکەی خۆی ئاشکرا کرد کە ئەویش دروستکردنی دوو پرینتەری تایبەتمەند لە بواری وێنەی فوتۆگراف ٦×٤ ڕاستەو خۆ لەکامیرا دیجیتالەکان و میموریەکان . ئەم دوو پرینتەرش PictureStation DPP FP55 و Picture Station DPP-FP35 ئەم ئامێرە وا دروست کراوە بەشێوەیەکی تایبەت بە قەبارەیکی بچووک وە کێشێکی کەم ئەمەش وای لێدەکات کەوا گواستنەوی و هەڵگرتنی لەگەڵ خوت ئاسان بێت هەر دووکیان بێ پیل کار دەکەن ئەمەش وای لێ دەکات کەوا بە بەردوامی لای کارەبا بێت .

وە هەروەها پرینتەری Picture Station DPP-FP55 جێگای میموریەکانی هەیە و شاشەی LCD ڕەنگاو ڕەنگی هەیە کە ٢ ئینجە بۆ سەیرکردنی وێنەکان وە لە سەر ئەمەش وا کراوە کە بتوانی لەسەر کامیرەکە دانانی قەبارەی وێنەکە و گۆرینی ڕەنگ و زیاد و کەم کردنی ڕەنگ و لادانی چاو سوّر کردنی وێنەوە لەمەش زیاتر ئەمەش گشتی بیّ ئەوەی کۆمپیوتر بەکار بهێنیت .

